# من درەختێکم

ئۆرهان پاموک
وەرگێڕانی سامان کەریم



ENDEŞE
ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە

# ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

**بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید**

**بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود**

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە
سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم
http://www.endeshe.net
andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com
http://www.facebook.com/Andeshalib
07501026400

پێشکەشە بە تۆ باوکە، کە هەمیشە ئەم
ئامۆژگارییەت دەکردم:
”مرۆڤ تەنیا یەک جار دەژی، بۆیە دەبێت
لە ژیاندا ئەو ئاراستەیە بگریتە بەر کە خۆت
ئارەزووی دەکەیت. **قورسە**! بەڵام **خۆشە**.“

**تۆ ڕاستت کرد: قورسە، بەڵام زۆر خۆشە.**

**هیچ شتێک هێندەی ژیان سەرسووڕهێنەر نییە، جگە لە نووسین.**

- ئیبنی زەرهانی

# ناوەرۆك

# پێشەکی

لەناو دڵی ئەم کتێبەدا دوو بابەت هەیە، کە ئارەزوومە لەبارەیانەوە خەیاڵدانم بخەمە گەڕ و خەیاڵ بئافرێنم، کە ئەوانیش: سیمای نهێنیداری مێژوو، هەروەها یادگارییەکانی سالانی منداڵی و خوێندکاری. لە ڕۆمانەکانمدا، لە نووسینە ئاساییەکانمدا، هەموو کات گەڕاومەتەوە بۆ ئەم دوو بابەتەوە. هەموو جارێکیش هەستم کردووە کە هەردوو بابەتەکە لەناو سەرمدا چوونەتەوە ناو یەک. واتە لایەنی منداڵئاسای مێژوو، لەگەڵ لایەنی مێژوویی منداڵی.

مەبەستم لە لایەنی منداڵئاسای مێژوو: توانای دۆزینەوەی خەیاڵی زۆر سادە و بنچینەیی و بەهێزە لە مێژوودا، جیاواز لە ژیانی ئێستامان. یان لانی کەم شەیداییەکم هەیە بۆ بابەتێکی لەم شێوەیە. لەوانەیە کێشە کۆنەکان، شتەکان، پەیوەندییەکان، بەنیسبەت ئێمەوە لەناو تارماییدا بن، بەڵام سەر بە دنیایەکی زۆر سادەترن وەک لەو دنیایەی ئێستامان. ئەگەر یادی دنیایەکی لەو شێوەیە سادەش نەکەین، بەبەردەوامی بیری لێ دەکەینەوە. لە کۆندا هێنانەئاخافتنی

درەختێک، تێگەیشتن لە جەللادێک، بینینی ئیرەییی پاشایەکی عاشق، ئاسان بوو. ئەم ئاسانییە هێزێک دەدات بە نووسین، تێگەیشتن و چێژی خەیاڵکردنەوە دەدات بە خوێنەر. لەم کتێبەدا کارم کردووە بۆ هەڵبژاردنی نووسینە هەرە بەهێز و هەرە ئاسانەکان بۆ تێگەیشتن، لەناو ئەو پەڕانەدا کە تاکو ئێستا نووسیومن گرنگە ئەوە بزانرێت کە مەرج نییە نووسینی بەهێز و تێگەیشتنی ئاسان لەیەک کاتدا پێکەوە هاتبن.

لەگەڵ ئەوەشدا منداڵی لایەنی مێژوویی و کۆمەڵایەتیی هەیە. هەموومان ئارەزووی ئەوە دەکەین بە شێوەیەکی شیعرئاسا بیری لایەنە جوانەکانی منداڵیمان بکەوێتەوە. لەبەر ئەوە یادگارییەکانی منداڵیمان لە سووچی هەرە بەهاداری بیر و مێشکماندا دەوەستن. با بەمە بڵێین لایەنی شیعریی منداڵیمان. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سەردەمی منداڵیمان لایەنی کۆمەڵایەتییشی هەیە. یادگارییەکانی خێزان، شەڕەکانی نێوان دایک و باوک، جیابوونەوەکان، لێدانەکانمان، ئەو شتانەی لە قوتابخانەدا ژیاوین، خۆشەویستی و ڕقمان بەرامبەر بە قوتابخانە، بەهەستترین وردەکاریمان دەداتێ لەبارەی کۆمەڵگە و پێکهاتەی ئەو وڵاتەی کە تێیدا دەژین. بەم تێوەژەنینە کۆمەڵایەتییە، پارچەیەک - ساڵەکانی قوتابخانەی ناوەندیی مەولود - لە ڕۆمانی *سەمەرەیەک لە سەرمدا*[1]

---

١. سەمەرەیەک لە سەرمدا، ڕۆمانێکی نوێی پاموکە، لە ساڵی ٢٠١٤دا بڵاو بووەوە، ئەم ڕۆمانە کە نووسەر لە ماوەی شەش ساڵدا تەوای کردووە، وەر گێڕدراوەتە سەر زمانی کوردیی شێوەزاری سۆرانی و ناوەندی ئەندێشە چاپ و بڵاوی کردۆتەوە.

بڵاو دەکەمەوە، کە سەرەڕای هەموو هەوڵەکانم، ماوەیەکی زۆرە نەمتوانیوە تەواوی بکەم. بەو شێوەیەش قارەمانەکەم، مەولودی فرۆشیاری کۆڵانەکان، کە چوار ساڵە پێکەوە دەژین، بۆ یەکەم جار دێتە بەر دیدی خوێنەر. هەردووکمان زۆر بەجۆشوخرۆشین.

کاتێک ساڵەکانی قوتابخانەی ناوەندیی مەولود و پارچەکانی ترم خستە ناو ئەم کتێبەوە، دەستکاریی دەقەکانم کرد. نووسینە کۆنەکانم گۆڕی. ڕستە و پەرەگرافم بۆ زیاد کردن، کورتم کردنەوە، سەردێڕم بۆ دانان. هەم لەبەر ئەوەی دەمویست ئەم کتێبە ببێت بە یەک پارچە، هەم - با دانیشی پێدا بنێم کە - تاکو ئێستاش چێژ لە یاریکردن لەگەڵ ئەم پارچانەدا دەبینم، کە زۆرم خۆش دەوێن.

بەڵێ ئیتر ئەمانە جوانترین ئەو پەڕانەن کە لە نزیکەی چل ساڵی - بەگوێرەی من - ژیانی نووسەریمدا نووسراون و هەریەکەیان دەتوانرێت بەتەنها بخوێنرێنەوە.

بیرۆکەی ئەم کتێبەمان لە ئێوارەخوانێکدا لەگەڵ ڕەشید چاواشی دۆستم و چاپکەر و بڵاوکەرەوەی گەنج، دارمین حادزیبەگۆڤیجدا، پێکەوە تاووتوێ کرد. سوپاسی ئەوان و هەموو کارمەندەکانی چاپ و بڵاوکەرەوەی یاپیکرێدی دەکەم، کە بە شێوازێکی دۆستانە پێشوازیی لە نووسەرە نوێکانیان دەکەن.

بویوک ئەدا، تەممووزی ٢٠١٢

## تێبینی بۆ خوێنەر: گێڕەرەوە کێیە؟

کاتێک ئەم پارچە سەربەستانەم لە ڕۆمان و یادداشتەکانمدا هەڵبژارد و خستمنە ناو ئەم کتێبەوە، ڕووبەڕووی پرسیارێکی بنچینەیی بوومەوە، کە لە ڕاستیدا پێویستە هەموو خوێنەرێکی بەئاگای ڕۆمان، هەموو ڕۆماننووسێکی بەئاگا، کاتێک لەناو چیرۆکێکدایە، بەردەوام بپرسێت و بیری لێ بکاتەوە، کە لێرەدا کێ کێشەکان دەبینێت، کێ دەیانگێڕێتەوە؟ ئەو دەنگەی لەم چیرۆکەدا قسە دەکات و دەگێڕێتەوە دەنگی کێیە؟

ڕۆماننووسی هونەرێکە، کە مرۆڤ لەناویدا بتوانێت باس لە ژیانی خۆی بکات، وەک بڵێی باس لە ژیانی کەسێکی تر بکات. باس لە ژیانی کەسێکی تر بکات، وەک بڵێی باس لە ژیانی خۆی بکات. هەر لەبەر ئەمەشە کە وا قورسە بەتەواوەتی تێبگەیت کە کێ قسە دەکات. من لە سەردەمی منداڵی و گەنجێتیمدا دەمویست ببم بە وێنەکێش. زۆر وێنەم کێشا - درەختی سەر بەرگی ئەم کتێبەش - ئەم ئەزموونەم لە ڕۆمانی *من ناوم سوورەدا* بەکار هێنا بۆ تێگەیاندن و ئاشناکردنی وێنەکێشەکانی ئیستانبوڵ لە ساڵانی ١٥٩٠کاندا. یاخود ئەو شتانەی کە بینیبووم، تێیدا ژیابووم، کاتێک لە ساڵانی ١٩٦٠کاندا لە ئەنقەرە لە قوتابخانەیەکی سەرەتایی حوکومی دەمخوێند، لە کۆتاییی ساڵانی ١٩٧٠دا، کاتێک بۆ ماوەیەکی دیاریکراو مامۆستای زمانی ئینگلیزی

بووم لە ئامادەییيەک، کە لە باڵتالیمانی[1] بوو لە ئیستانبوڵ، خستمنە ناو چیرۆکی مەولودی فرۆشیارە قارەمانەکەمەوە. یاخود ئەو چیرۆکانەی کە لە کەسانی ترەوە گوێم لێ بوو، ئەو چیرۆکانەی کە بیرم لێ کردوونەتەوە و کردوومنەتە بەری قارەمانی ڕۆمانێک، کە لە من دەچێت. یاخود کاتێک لە ڕۆمانەکانمدا لە زمانی کەسی یەکەمەوە قسە دەکەم، وەک: "من،" لە ڕاستیدا چوومەتە ناو ناسنامەی کەسێتییەکی ترەوە. ئەم کەسێتییەی تریش، بۆ نموونە وەک جەلال سالیکی گۆشەنووسی ڕۆژنامە لە کتێبی *ڕەش*دا، لە ڕۆمانەکەدا دەست دەکات بە گێڕانەوەی چیرۆکێک لە زاری کەسێکی ترەوە...

بۆ ئەوەی هەموو ئەم دەنگانە و گۆڕینی ناسنامانە ڕوون بکەمەوە، لە سەرەتای بەشەکاندا تێبینیم نووسیوە، پیشانی دەدات کە کێ قسە دەکات.

ئۆرهان پاموک

---

١ باڵتالیمانی: گەڕەکێکە لە کەنار دەریادا لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئەوروپا.



# جەللاد و سیمای گریاو

**[لە *کتێبی ڕەش*ــەوە. جەلال سالیکی گۆشەنووسی ڕۆژنامە دەیگێڕێتەوە، کە یەکێکە لە قارەمانەکانی ناو ڕۆمانەکە.]**

بۆچـی کوڕێکـی چاوبەفرمێسـک ئێمـە دەشـڵەژێنێت؟ کاتێـک ژنێکـی چاوبەفرمێسـک دەبینیـن، بارێکـی نائاساییە، ڕەنگـە لـە ژیانـی ڕۆژانەمانـدا وەک بارێکـی بەهەسـت و بەئـازار ببینیـن، بـەڵام بـە خۆشـەویسـتی و لـە ناخـەوە ئـەو پەسـەند دەکەیـن. بـەڵام کوڕێکـی چاوبەفرمێسـک، ناخمـان پڕ دەکات لـە هەسـتی بێچارەیـی. ئـەم کـوڕە یـان گەیشـتۆتە خاڵێـک کـە نەتوانێـت چیدی کارێـک ئەنجام بدات، وەک بڵێی کۆتایی دنیا بێت - بۆ نموونـە وەک سـاتی مردنـی کەسـێکی خۆشـەویسـتی - یـان لـە دنیای ئـەودا لایەنێک هەیە کە لەگەڵ دنیای ئێمـەدا ناگونجێت؛ لایەنێـک کـە نائاسـوودەکەرە، تەنانـەت سـەرسـووڕهێنەرە. هەموومـان ئـەو سەرسـووڕمان و حەپەسـانەی سـەر سـیمای کەسـێک دێتـە بەرچاومـان، کاتێـک ئـەو کەسـە سـەیری نەخشـەیەکی جوگرافـی دەکات و پێـی وایـە بەتـەواوی شـارەزای هەمـوو نەخشـەکەیە، کەچـی لەنـاکاو چـاوی دەچێتـە

سەر وڵاتێک کە هیچی لەبەرەوە نازانێت، لەم بارەیەوە چیرۆکێک باس کراوە کە لەناو بەرگی شەشەمی کتێبەکەی نایمادا (کتێبی مێژوو) و هەروەها لەناو کتێبەکەی محەمەد خەلیفەدا کە بەناوی *مێژووی گیلمان*ەوەیە و لە کتێبەکەی قادری ئەدیرنەییشدا ڕێکەوتم کردووە، کە بە ناوی *مێژووی جەلالەکان*ەوەیە. چیرۆکە ڕاستەقینەکەی خوارەوە بەزۆری لە گێڕانەوەکانی کتێبی *مێژووی جەلالەکان*ەوە نزیکە. (بەدەر لەوە، چاوەڕوانین وەزارەتی پەروەردە ئەم دەستنووسە کۆنە وەر بگێڕێتە سەر نووسینی نوێ و بە وێنەکانی ناویەوە بڵاوی بکاتەوە، کە بە ڕێژەیەکی زۆر پەروەردەییە.)

زۆر نا، سێ سەد ساڵ لەمەوبەر لە شەوێکی بەهاردا، قەرە عومەر، کە بەناوبانگترین جەللادی ئەو سەردەمە بوو، بە سواری ئەسپەکەیەوە نزیک دەبووەوە لە قەڵای ئەرزوڕووم. دوانزە ڕۆژ لەوەوبەر بە بڕیاری پاشا، بە فەرمانداریێتیی بۆستانجیباشی جەللاد، بە فەرمانێکەوە کە درابووە دەستی، نێردرابوو بۆ لەسێدارەدانی عەبدی پاشای حوکمداری قەڵای ئەرزوڕووم. ئاسوودە بوو، چونکە لە ماوەی دوانزە ڕۆژدا ڕێگەی نێوان ئیستانبوڵ-ئەرزوڕوومی بڕیبوو، لە کاتێکدا گەشتیارێکی ئاسایی لەو وەرزەدا دەیتوانی ڕێگەکە بە مانگێک ببڕێت؛ لەناو فێنکیی شەوی بەهاردا ماندووبوونەکەی بیر چووبووەوە، بەڵام لەسەروو ئەوەشەوە بێدەنگی و پەنگییەک باڵی کێشابوو بەسەریدا، کە هیچ کاتێک پێش بەجێهێنانی ئەرکەکەی، هەستی پێ نەکردبوو. وەک بڵێی هەستی بە تارماییەکی نەفرەتی، یاخود هەستی بە شڵەژانێک دەکرد، کە دەبێتە کۆسپ، بۆ ئەوەی نەتوانێت ئەرکەکەی بە حەق و ڕووسپیەتی بەجێ بهێنێت.

تا بڵێی ئەرکەکەی قورس بوو. بەتەنها دەچوو بۆ کۆشکی پاشایەک، کە پڕە لە پیاوەکانی پاشا، کە هیچ نایانناسێت و نەیبینیون، فەرمانەکە دەداتە پاشا، بە هێزی متمانە و بەجەرگیی خۆی، هەستێک دەخاتە دڵی عەبدی پاشا و دەوروبەرییەوە، کە نەتوانن بێهوودە بەرپەرچی بڕیاری پاشا بدەنەوە، ئەگەرێکی بچووکیشە، بەڵام ئەگەر پاشا درەنگ بکەوێت لە هەستکردنی بەم بێهودەیییە، پێش ئەوەی دەوروبەری پاشا بکەونە جووڵە بە نیەتی تاوان، ئەوکات قەرە عومەر بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدات، یەکسەر پاشا دەکوژێت. لەبەر ئەوەی لەم کارەدا ئەوەندە بەئەزموون بوو، هەرگیز ئەم شپرزەییە ڕووی نەدەدا کە ئێستا هەستی پێ دەکرد، لە سی ساڵ ژیانی پیشەکەیدا، بە دەستپێکردنی لە سەردەمی شاگردێتییەوە تاکو ئەمڕۆ، زیاتر لە شەش سەد کەسی کوشتبوو، نزیکەی بیست شازادە، دوو سەرۆکوەرزیر، شەش وەزیر، بیستوسێ پاشا، دز و جەردە، تاوانبار و بێتاوان، ژن، کوڕ، منداڵ، پیر، کریستیان، مسوڵمان، ئەشکەنجەی هەزارەها کەسی دابوو.

بەیانییەکی وەرزی بەهار بوو، پێش ئەوەی جەللاد بچێتە ناو شار، لەکەنار ئاوێکدا لەسەر ئەسپەکەی دابەزی، لەنێوان جریوە و نەغمەی باڵندەکاندا دەستنوێژی گرت، نوێژی کرد. دوعاکردن و پاڕانەوەی لە خوا، بۆ ئەوەی کارەکەی بەباشی بەڕێوە بچێت، کارێک بوو کە زۆر کەم دەیکرد، بەڵام وەک هەموو جارەکانی تری، خوا دوعای ئەم کۆیلە ئیشکەرەی پەسەند کرد.

بەو شێوەیەش هەموو شتێک بەباشی بەڕێوە چوو. عەبدی پاشا هەر کە جەللادەکەی بینی گوریسێکی چەوری بە کەمەرەوەیە، کڵاوێکی سووری خوری لە سەرە بەگوێزانتاشراوەکەیدایە، یەکسەر تێگەیشت، بەڵام هیچ بەرهەڵستییەکی وەهای نەکرد کە پێی بوترێت نایاسایی. لەمێژەوە خۆی ئامادە کردبوو بۆ چارەنووسەکەی، لەوانەشە لەبەر ئەوە بێت کە تاوانەکەی خۆی دەزانی.

سەرەتا فەرمانەکەی دە جار خوێندەوە، هەموو جارێکیش بە هەمان ئاگاییەوە - ئەمە تایبەتمەندییەکە، کە لە پاشاکان و پیاوانی دەوڵەتدا دەبینرێت کە پابەندن بە یاساکانەوە - دوای ئەوەی فەرمانەکەی خوێندەوە، بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش و بەرچاوەوە ماچی کرد و خستیە سەر سەری. - ئەمە هەڵوێستێک بوو لەو کەسانەدا دەبینرا کە باوەڕیان وا بوو بتوانن کاریگەرییەک لەسە دەوروبەریان دروست بکەن، قەرە عومەریش بە هەڵوێستێکی گێلانەی دەزانی - داوای کرد کە دەیەوێت قورئان بخوێنێت و نوێژ بکات - ئەم ویستە لەو کەسانەدا دەبینرا، کە بەڕاستی باوەڕیان هەبوو، هەروەها بۆ ئەوەی کات درێژ بکەنەوە - دوای نوێژکردنی، بەردە بەنرخەکان، ملوانکە، مستیلەکانی دابەش کرد بەسەر پیاوەکانی دەوروپشتیدا، بە وتنی، "بۆ ئەوەی یادم بکەنەوە، شمەکەکانیشم نەکەوێتە لای جەللادەکە." - ئەمە هەڵوێستێک بوو لەو کەسانەدا دەبینرا کە بەتوندی باوەشیان کردووە بە ژیاندا، لەگەڵ ئەوانەی کە ئەوەندە ئاسایی و ڕووکەشن، بە ڕادەیەک کە ڕقیان لە جەللادەکەیانە - نەک هەر وەک ئەوانەی چەند هەڵوێستێک لەم هەڵوێستانە پیشان دەدەن،

بەڵکو وەک ئەوانەی کە هەموو هەڵوێستەکانیان پیشان دەدەن. عەبدی پاشا پێش ئەوەی گوریسە چەورەکە بکرێتە ملی، بەجنێودانەوە هەوڵی پەلاماردانیشی دا، بەڵام دوای ئەوەی مستەکۆڵەیەکی باش لەلایەن جەللادەکەوە درا بە کەناری چەناگەیدا، کەوتە سەر ئەژنۆ، کەوتە ناو چاوەڕوانیی مردنەوە. دەگریا.

گریانیش هەڵوێستێک بوو لەو هەڵوێستانەی کە قوربانییەکان لەم جۆرە دۆخانەدا پیشانیان دەدا، بەڵام جەللاد لە سیمای گریاوی عەبدی پاشادا شتێکی وەهای بینی، کە لە ماوەی سی ساڵی ژیانی پیشەکەیدا بۆ یەکەم جار هەستی بە بێبڕیاری کرد. بەو شێوەیەش، شتێکی کرد کە پێشتر قەت نەیکردبوو: پێش ئەوەی بیخنکێنێت سیمای قوربانییەکەی بە پارچەقوماشی عەبایەک داپۆشی. ئەمە کارێک بوو کە لە هاوپیشەکانی خۆیدا دەیبینی، ڕەخنەی لێ دەگرتن، چونکە باوەڕی وا بوو کە جەللادێک بۆ ئەوەی کارەکەی بێ وەستان و بێ کەموکورتی بەجێ بهێنێت، دەبێت تا کۆتایی بتوانێت سەیری چاوی قوربانییەکەی بکات.

دوای ئەوەی دڵنیا بوو کە مردووە، بێ ئەوەی کات بەفیڕۆ بدات، بە گوێزانێکی تایبەت، کە پێی دەڵێن شفرە، کەللەی مردووەکەی لە جەستەی کردەوە، یەکسەر کەللە بڕدراوەکەی کردە ناو توورەکەیەکەوە، کە بە مووی بزن دروست کرابوو، ناو توورەکەکەش پڕ بوو لە هەنگوین، بەتەواوەتی نوقمی کرد لەناو هەنگوینەکەدا. بۆ ئەوەی بۆ پاشای بسەلمێنێت کە ئەرکەکەی بەسەرکەوتوویی بەجێ هێناوە، دەبووایە بێ ئەوەی کەللەی قوربانییەکە بشێوێ و

تێک بچێت، بیگەیێنێتە ئەوانەی کە لە ئیستانبوڵ پشکنینی بۆ دەکەن دڵنیا بن کە کەللەی عەبدی پاشایە، چونکە ئەگەر کەللەی بڕدراوی پاشا ناودارەکە نمایش نەکرێت و پیشانی کۆمەڵگە نەدرێت، لایەنگرەکانی بانگەشە دەکەن کە پاشاکەیان لە ژیاندایە و کەسێکی هاوشێوەی پاشا دەخەنە شوێنی پاشا، لەوانەیە یاخی ببوونایە.

کاتێک جەللادەکە کەللە بڕدراوەکەی بەئاگاوە خستە ناو توورەکە پڕ لە هەنگوینەکەوە، جارێکی تر بەسەرسامییەوە ئەو دەربڕینە ترسناک و نهێنیدارەی سیما گریاوەکەی پاشای بینی، ئیتر هەرگیز نەیتوانی تا کۆتاییی ژیانی، کە زۆر دوور نەبوو، ئەو دیمەنە لەبیر خۆی بباتەوە.

یەکسەر سواری ئەسپەکەی بوو، لە شار دەر چوو. کاتێک جەستەی قوربانییەکە بە چاوی پڕگریانەوە و بە ڕێوڕەسمێکی ئازاربەخشەوە نێژرا، جەللادەکە دەیویست لەگەڵ کەللەکەی، کە بە لاتەنیشتی زینی ئەسپەکەیەوە بوو، بە لانی کەمەوە بە دووریی دوو ڕۆژ لە شوێنی ڕووداوەکەوە دوور بێت. بەو شێوەیەش، دوای ڕێکردنێکی بەردەوام، کە ڕۆژ و نیوێکی خایاند، گەیشتە قەڵای کەماهـ، لە کاروانسەراکە تێروپڕ نانی خوارد، بە توورەکەکەیەوە چووە ژوورەکەی خۆی، خەوێکی قووڵی لێ کەوت.

کاتێک لە خەوە قووڵە نیوڕۆژخایەنەکە خەبەری بووەوە، لە خەویدا خۆی لە ئەدیرنە بینیبوو، کە سەردەمی منداڵیی تێدا بەسەر بردبوو، پاشان لەو شووشە گەورەیە نزیک بووەوە، کە پڕ بوو لە مرەبای هەنجیر و دایکی هێندەی کولاندبوو نەک تەنها ناوماڵەکە و باخەکەیان، بەڵکو هەموو

گەرەکەکەی پڕ کردبوو لە بۆنێکی مێخۆشی هەنجیر، سەرەتا وا هاتە بەرچاوی ئەو هەنجیرە سەوزە خڕە بچووکانە چاوی گریاناویی کەللەیەکە؛ دواتر بەدەر لەوەی دەیزانی شتێکی قەدەغە دەکات، بە هەستی تاوانباریتیی گەواهیداربوونی ئەو ترسناکییە ئاڵۆزەی سیما گریاوەکەوە، سەری شووشە هەنجیرەکەی کردەوە، پاشان لەناو شووشەکەوە دەنگی هەنسکی گریانی کوڕێکی کامڵ هاتە دەرێ، بەبێچارەیییەکەوە کە دەست و قاچی مرۆڤی بەند دەکرد، حەپەسا.

شەوی دواتر، لە کاروانسەرایەکی تر، لە جێگەیەکی تری خەونیدا، لە ناوەڕاستی خەودا، خۆی لە یەکێک لە سەرلەئێوارەکانی گەنجێتیدا بینی: کەمێک پێش ئەوەی دنیا تاریک بکات، لە یەکێک لە کۆلانەکانی ناو شاری ئەدیرنەدا بوو. لەسەر ئاگادارکردنەوەی هاوڕێیەکی، کە نەیدەزانی کێیە و نەیدەناسییەوە، لە سەرێکی ئاسمانەوە ئاوابوونی خۆر، لە سەرەکەی تریەوە ڕووە سپییە کزەکەی مانگی دەبینی کە بەرز دەبووەوە. دواتر تاکو خۆر ئاوا بووایە و دنیا زیاتر تاریکی بکردایە، ڕووە خڕەکەی مانگ بەدرەوشانەوەوە زیاتر دەر دەکەوت، بێ ئەوەی زۆریشی پێ بچێت، ڕوون دەبووەوە کە ئەم ڕووە درەوشاوەیە سیمایەکە و دەگری. ئەو شتەی کە کۆلانەکانی ئەدیرنەی گۆڕیبوو بۆ کۆلانە ئاڵۆز و نائاسوودەکانی شارێکی تر، لایەنە بەئازارەکەی ڕووی مانگ نەبوو، کە گۆڕابوو بۆ سیمایەکی گریاو، نەخێر، بەڵکو لایەنە نهێنیدار و نادیارەکەی بوو.

جەلال سەرلەبەیانی بیری کردەوە، ئەو ڕاستییەی کە لە ناوەڕاستی خەوەکەیدا دۆزیویەتیەوە لەگەڵ یادگارییەکانی

خۆیدا دەگونجێت. بە درێژایی ژیانی پیشەییەکەی، هەزارەها سیمای کوڕی گریاوی بینیبوو، بەڵام هیچیەکێک لەو سیمایانە نەیخستبووە ناو هەستی تاوانباری، ترس، یاخود بێبەزەییەوە. بە پێچەوانەوە، دڵگران و خەمبار دەبوو بۆ قوربانییەکانی، بەڵام یەکسەر ئەم هەستەی بە لۆژیکی دادپەروەری، سەپێنراوی، نەگەڕانەوەی فەرمان، هاوسەنگیی وەر دەگرت، چونکە دەیزانی ئەو قوربانییانەی کە کەللەیان دەپەڕێنرێت، دەخنکێنرێن، ملیان دەشکێنرێت، هەموو کات لە جەللادەکەیان زۆر زیاتر زانیارییان هەیە لەسەر ئەو زنجیرە هۆکار و بابەتانەی کە خۆیان دەبات بەرەو مردن. هیچ شتێک نەبوو بەرگە نەگیرێت لە دیمەنی کوڕێکدا کە بەپەلەقاژێ و چاوبەگریان و تلانەوەی لەناو چڵمدا، بە هەنسکی گریانەوە بچێت بۆ مردن. جەللاد نە کوڕە گرینۆکەکانی نزم دەکردەوە، وەک هەندێک گێل کە لە سێدارەدراوەکانەوە چاوەڕوانی قسەی بوێرانە و جۆرە هەڵوێستیک دەکەن کە بچنە ناو مێژوو و ئەفسانەکانەوە، نە دەکەوتە ناو هەستێکی بەزەییەوە، کە دەست و قۆڵی بەند بکات، وەک هەندێک گێلی تر، کە هەرگیز نەیانتوانیوە لە ڕێکەوت و بێبەزەیی ژیان بگەن.

ئەو شتەی لە خەوەکانیدا دەست و قۆڵی بەند دەکرد چی بوو؟ بەیانییەکی خۆرەتاو، کاتێک بە توورەکە لەموودروستکراوەکەی سەر زینی ئەسپەکەیەوە لەنێوان شاخ و دۆڵە قووڵە بەتاوێرتەنراوەکانەوە ڕێی دەکرد، جەللاد بیری کردەوە، ئەو شتەی کە دەست و قۆڵی بەند دەکات پەیوەندیی هەیە بەو بێبڕیارییەی لە ناخیدا هەستی پێ کردبوو، پێش

ئەوەی بچێتە ئەرزوڕووم. هەستێکی نەفرەتی لە ڕۆحیدا بوو، کە هەستی بە تارماییەکەی کردبوو، تا دەڕۆی زیادی دەکرد. پێش ئەوەی کەللەی قوربانییەکەی لە جەستەی بکاتەوە، نهێنییەکی لە سیمایدا بینیبوو، کە خستبوویە بارێکەوە ناچار بێت بە پارچەقوماشی عەبایەک سیمای عەبدی پاشا دابپۆشێت. جەللاد بە درێژاییی ڕۆژەکە، کاتێک بە سواری ئەسپەکەیەوە لەنێوان تاوێرەبەردە سەرسووڕهێنەرەکانی ساربەوە، درەختە قاییم و سنەوبەرەکان - کە لە شێوەی کەشتییەکی چارۆکەداری شێوەمەنجەڵ و شێرێکدا بوون، کە هەنجیرێک جێگیر کراوە لە جێی سەریدا - لەنێوان وردەبەردە سەیروسەمەرەکانی کەنار ڕووبارە ساردوسڕەکەوە، کە لە هەموو کاتێک زیاتر نامۆ و زیاتر سەرسووڕهێنەر بوون، ڕێی دەکرد، ئیتر بۆ جارێکی تر هیچ بیری لە دەربڕینی سیمای ناو تورەکەکە نەکردەوە، کە بە زینی ئەسپەکەیەوە بوو. ئیتر سەرسووڕهێنەرترین شت دنیا بوو؛ دنیایەکی نوێ کە تازە دۆزیبوویەوە، یەکەم جار بوو کە درکی پێ دەکرد.

لە شەوە بێخەوەکانیدا تازە درکی دەکرد کە هەموو درەختەکان لە سێبەرێکی تاریک دەچن و لەنێوان یادگارییەکانیدا دەجووڵێنەوە. بۆ یەکەم جار هەستی دەکرد ئەو شوانە بێگوناحانەی کە لە قەدپاڵە تازەسەوزبووەکاندا ڕانەکانیان دەلەوەڕێنن، وەک بڵێی لەسەر شانیان لە جێی سەری خۆیان ئەشیای کەسێکی تریان هەڵگرتووە. بۆ یەکەم جار تێدەگەیشت ئەو لادێ بچووکە دە ماڵییانەی کە لە قەدپاڵی شاخەکاندا دروست کراون، بیری ئەو پێلاوە بەتاڵانەی دەخاتەوە کە لە بەردەمی دەرگای مزگەوتەکاندا

ڕیز کراون. دوای نیوڕۆژ کە بەنێوان شاخە مۆرەکانی ڕۆژئاوادا، لەژێر پەڵەهەورەکانی سەر شاخەکاندا ڕێی دەکرد، کە ڕێک لە وێنە دەچوون، تازە دەیبینی کە ئاماژە دەدەن بەوەی دنیا ڕووتە، شوێنێکی ڕووتوقووتە. ئێستا تێدەگەیشت کە هەموو ڕوەکەکان، ماددەکان، ئاژەڵە شەرمنەکان ئاماژەن بۆ دنیایەک هێندەی یادگارییەکان کۆن، هێندەی بێچارەیی سادە، هێندەی کابووسەکان ترسناک. تاکو ڕێی بکردایە بەرەو ڕۆژئاوا، تاکو سێبەرە درێژبووەکان واتایان بگۆڕیایە، جەللاد هەستی دەکرد کە لە دەوروبەریەوە ئەو ئاماژە و نیشانانەی کە نەیدەتوانی نهێنییەکەی بدۆزێتەوە، دزە دەکات، وەک دزەکردنی خوێن لەناو دیزەیەکی درزبردوودا.

کاتێک دنیا تاریکی کرد، لەناو ئەو کاروانسەرایەدا، کە بۆ پشوودان بۆی چووبوو، تێروپڕ نانی خوارد، بەڵام تێگەیشت کە بە توورەکەکەوە ناتوانێت خۆی حەپسی ژوورێک بکات و بخەوێت. لە ناوەڕاستی خەوەکەیدا، ئەم کابووسە ترسناکە وەک جەراحەتێک کە لە برینێکی کولاوەوە دێت، بەهێواشی بڵاو دەبووەوە بەناویدا؛ دەیزانی کە لەم خەوەدا ناتوانێت بەرگەی ئەو سیما بێچارەیە بگرێت، کە هەموو شەوێک بە خۆداپۆشین بە بەرگی یادگارییەکی تریەوە دەگری. بۆیە بەدەم سەیرکردنی سەرسامانەوە بۆ سیمای مرۆڤەکانی ناو کاروانسەرا قەرەباڵغەکە، بۆ ماوەیەک پشووی دا، دواتر بەردەوام بوو لە ڕێگەکەی.

شەو سارد و بێدەنگ بوو؛ ڕەشەبا نەبوو، تەنانەت لقێکیش جووڵەی نەدەکرد، ئەسپە هیلاکەکەشی خۆی ڕێگەی خۆی دەدۆزییەوە. ماوەیەکی زۆر بێ ئەوەی هیچ شتێک

ببینێت، وەک ڕۆژە ڕابردووە خۆشەکانی، بێ ئەوەی بیر لە پرسیارێک بکاتەوە کە مێشکی بشڵەژێنێت بەردەوام بوو لە ڕێگەکەی، دواتر بیری دەکردەوە کە بە هۆی تاریکاییەوە بووە. چونکە کاتێک مانگ لەنێوان هەورەکانەوە دەر کەوت، درەختەکان، سێبەرەکان، تاوێرەکان هێدی هێدی بوون بە ئاماژەی نهێنییەکی ئاڵۆز. ئەوەی کە ترسناک بوو، نە بەردە بەئازارەکانی مەزارەکان بوو، نە درەختە سەرڤییە تەنهاکان، نە لوورەی گورگەکانی شەوە بێدەنگ و تەنهاکە. ئەو شتەی کە ئەوەندە دنیای سەرسووڕهێنەر کردبوو تا ئەو ڕادەیە لێی بترسێت، ئەوە بوو وەک بڵێی دنیا دەیەوێت چیرۆکێک بگێڕێتەوە. وەک بڵێی دنیا دەیویست شتێک بە جەللادەکە بڵێت، ئاماژە بۆ واتایەک دەکات، بەڵام ئەم قسەیە لەناو نادیارییەکی دووکەڵاویدا ون دەبوو، وەک چۆن لەناو خەوێکدا ڕوو دەدات. بەرەبەیان جەللاد لە بن گوێچکەیدا گوێی لە دەنگی هەنسک بوو.

کاتێک دنیا ڕووناک بووەوە، بیری کردەوە کە دەنگی هەنسکەکە یارییەکی ڕەشەبا نوێکەیە، کە لەسەر لقەکان دەیکات، دواتر بە خۆی وت کە ئەمە لە ئەنجامی هیلاکی و بێخەویدایە. دەمەونیوەڕۆ دەنگی هەنسکی ناو توورەکەی سەر زینەکە ئەوەندە بەباشی دەبیسترا، جەللاد لەسەر ئەسپەکەی دابەزی، وەک کەسێک کە لە نیوەی شەودا لە جێگە گەرمەکەیدا هەڵدەستێت بۆ ئەوەی جیڕەجیڕی بێزارکەری پەنجەرەیەک نەهێڵێت کە بەباشی دانەخراوە، گوریسەکەی باشتر توند کرد، کە توورەکەکەی بە زینەکەیەوە پێ بەستبووەوە. بەڵام دواتر، لەژێر بارانەکەدا، کە بێبەزییانە

دەباری، نەک هەر بەتەنها گوێبیستی هەنسکەکان، بەڵکو هەستی بە فرمێسکی چاوی سیما گریاوەکەش دەکرد.

کاتێک خۆر سەرلەنوێ دەر کەوتەوە، تێگەیشت کە نهێنیی دنیا لەگەڵ نهێنییەکی دەربڕینی سیما گریاوەکەدا پەیوەندییەکیان هەیە. وەک بڵێی واتای دنیا ون ببوو، لە کۆندا ئەو دنیایەی کە باش دەماننناسی و ئاشنای بووین، ڕوون و ئاشکرا بوو، واتایەکی ئاساییی سەر سیماکان، دەربڕینێکی ئاسایی بەپێوە هێشتبوویەوە. دوای دەرکەوتنی ئەو دەربڕینە سەیرەی سیما گریاوەکە و جێهێشتنی جەللادەکە لەناو تەنهاییەکی ترسناکدا، واتای هەموو شتێک ون ببوو، وەک چۆن هەموو شتێک سەروژێر دەبێت دوای شکانی جامێکی ئەفسوونی یان سووراحییەکی شووشەی سیحراوی. کاتێک جلوبەرگە تەڕەکانی بەری، لەبەر گەرمای خۆردا وشک دەکردەوە، تێگەیشت بۆ ئەوەی هەموو شتێک بگەڕێتەوە بۆ باری ئاساییی کۆن، پێویستە ئەو دەربڕینە سەیرەی سیمای کەللەی ناو تورەکەکە بگۆڕێت، کە هەر وەک ماسکێک لکاوە بە سیماکەوە. لە لایەکی ترەوە فەرمانی پێ درابوو کە دوای سەربڕینی کەللەکە و نوقمکردنی لەناو توورەکە پڕ لە هەنگوینەکەدا، بەگوێرەی ئەخلاقی پیشەکەی، دەبووایە بێ ئەوەی کەللەکە تێک بدات بیهێنێت بۆ ئیستانبوڵ.

لە بەیانیی ئەو شەوە شێتکەرەی کە بەسەر ئەسپەکەیەوە بەبێ خەو بەڕێی کرد، دەنگی هەنسکە بێکۆتاکان ببوون بە موزیکێکی بێزارکەر، جەللادەکە ئەوەندە دنیای لەلا گۆڕابوو، بەلایەوە قورس دەبوو باوەڕ بکات کە خۆی خۆیەتی. درەختە چنارەکان، سنەوبەرەکان، ڕێگە قوڕاوییەکان، ئەوانەی سەر

کانییەکانی لادێ کە ئەمیان دەبینی و بەترسەوە ڕایان دەکرد، لە دنیایەکەوە هاتبوون کە هیچ نەیدەناسی و ئاشنای نەبوو. کاتی نیوەڕۆ لە شارۆچکەیەکدا کە پێشتر نەیدەزانی هەیە، کاتێک بە غەریزەیەکی ئاژەڵییەوە خۆراکی خوارد، ئەستەم بوو بەلایەوە کە بزانێت ئەو خۆراکە چییە کە دەیخوات. کاتێک لە دەرەوەی شارۆچکەکەدا دابەزی و لە بن درەختێکدا ڕاکشا، بۆ ئەوەی ئەسپەکەی کەمێک پشوو بدات، تێگەیشت ئەو شتەی کە زەمانێک وای زانیوە ئاسمانە، گومەزێکی شینی سەیرە، کە قەت تێی نەگەیشتووە و نەیبینیوە. کە خۆر ئاوا بوو، سواری ئەسپەکەی بوو. بەردەوام بوو لە ڕێگەکەی، بەڵام هێشتا ڕێگەی شەش ڕۆژی لەبەردەمدا مابوو. ئیتر تێگەیشتبوو ئەگەر هەنسکەکانی ناو توورەکەکە بێدەنگ نەکات و دەربڕینی سیما گریاوەکە نەگۆڕێت، ئەگەر ئەو کارە سیحراوییە نەکات کە دنیاکەی دەگەڕێنێتەوە بۆ دنیا کۆنە ئاساییەکە، بە هیچ شێوەیەک ناگاتە ئیستانبوڵ.

دوای تاریکبوونی دنیا، ڕێکەوتی بیرێکی کرد لە کەناری لادێیەکدا، کاتێک گوێبیستی وەڕەی سەگەکان بوو لە لادێکەدا، لەسەر ئەسپەکەی هاتە خوارێ. توورەکەی سەر زینی ئەسپەکەی داگرت، دەمەکەی کردەوە، قژی کەللەکەی گرت و لەناو هەنگوینەکەدا دەری هێنا. بەو سەتڵەئاوانەی کە لە بیرەکەدا دەری دەهێنا، بەوریاییەوە کەللەکەی شۆرد، وەک بڵێی کۆرپەیەکی تازەلەدایکبوو دەشوات. دوای ئەوەی بە پارچەقوماشێک قژ و تەنانەت کونی گوێچکەکانیشی وشک کردەوە، لەبەر ڕووناکیی تریفەی مانگدا سەیری سیماکەی کرد: دەگریا، هیچ تێک نەچووبوو، هەمان دەربڕینی

بەرگەنەگیراو، بێچارەییبیە بیرنەچووەوەکە لەسەر سیماکە بوو.

کەللەکەی لە کەناری بیرەکەدا دانا، لە زینی ئەسپەکەیدا ئامێرەکانی پیشەکەی هەڵگرت و گەڕایەوە، کە بریتی بوون لە دوو چەقۆی تایبەت و شیشە ئاسنینەکانی ئەشکەنجەدان، کە دەمەکەیان کول بوو. سەرەتا بە چەقۆکان بەهێواشی بە برینی پێست و ئێسقانەکەی دەستی کرد بە ڕێککردنەوەی کەناری دەمی کەللەکە. دوای هەوڵێکی زۆر، لێوەکانی بەتەواوەتی پارچەپارچە کردبوو، بەڵام ئەگەر زۆریش نەبێت توانیبووی دەمەکە بهێنێتە بارێک کە پێبکەنێت. دواتر دەستی کرد بە کارێکی وردتر، دەستی کرد بە کردنەوەی چاوەکانی کە بەئازارەوە بەزەقی ڕەق ببوون. دوای هەوڵێکی زۆر هیلاککەر و درێژ، کاتێک دەربڕینی پێکەنینەکەی بڵاو کردەوە بە هەموو سیماکەدا، ئیتر هیلاک و سست ببوو. بەڵام کە لەسەر پێستی لاچەناگەی کەللەکە نیشانەی مۆریی مستەکۆڵەکەی بینی، کاتێک پێش ئەوەی عەبدی پاشا سەر ببڕێت لێی دابوو، دڵخۆش بوو. بەدڵخۆشییەکی منداڵئاساوە کە توانیویەتی هەموو شتێک بخاتە ڕێوشوێنی خۆی، بەڕاکردن ئامێرەکانی برد، لە زینی ئەسپەکەدا جێگیری کردن.

کاتێک گەڕایەوە، کەللەکە لە شوێنی خۆیدا نەمابوو. لە یەکەم ساتدا ئەمەی وەک یارییەکی کەللە سیماپێکەنیناوییەکە بینی. کە تێگەیشت کەللەکە کەوتۆتە ناو بیرەکەوە، بێ ئەوەی هیچ هەست بە بیبڕیاری بکات، ڕای کرد بۆ نزیکترینماڵی لادێکە، بە لێدانی دەرگایەک ئەوانەی ژوورەوەی خەبەر کردەوە. باوک و کوڕێک دەرگاکەیان لێ کردەوە، بینینی

جەللادەکە لە بەرامبەریاندا بەس بوو بۆ ئەوەی باوکە پیر و کوڕەکەی بەترسەوە پەیڕەوی فەرمانەکەی بکەن. هەرسێکیان پێکەوە تاکو بەیانی کاریان کرد بۆ ئەوەی کەللەکە لەبنی بیرەکەدا دەر بهێننەوە، کە زۆریش قووڵ نەبوو. دنیا لە ڕۆژبوونەوەدا بوو، کوڕەکە، کە گوریسی لەسێدارەدانەکەیان بەستبوو بە ناوقەدیەوە و شۆڕیان کردبووەوە بۆ ناو بیرەکە، کەللەکەی بە قژ گرتبوو، بە ترس و هاوارهاوارەوە گەڕایەوە سەر زەوی. کەللەکە پارچەپارچە ببوو، بەڵام ئیتر نەدەگریا. جەللادەکە بەئاسوودەییەوە کەللەکەی وشک کردەوە، نوقمی ناو توورەکە هەنگوینەکەی کرد، چەند قرووشێکی دایە دەستی باوک و کوڕەکە، دواتر لە لادێکەوە بەدڵخۆشی بەرەو ڕۆژئاوا کەوتە ڕێ.

کاتێک خۆر هەڵهات، باڵندەکان لەنێوان درەختی بەهاردا جریوەیان دەهات، جەللادەکە بە دڵخۆشییەکەوە کە بارتەقای ئاسمانەکان فراوان بوو، بە جۆشوخرۆشی ژیانەوە، تێگەیشت کە دنیا سەرلەنوێ ئەو دنیا کۆن و ئاشنایەیە. ئیتر گوێی لە دەنگی هەنسکەکەی ناو توورەکەکە نەبوو. پێش ئەوەی ببێت بە نیوەڕۆ، کە لە ئەسپەکەی دابەزی، لە کەناری دەریاچەیەکدا کە بە درەختی سنەوبەر داپۆشرابوو، بەدڵخۆشییەوە ویستی بخەوێت، خەوێکی قووڵ، کە چەندەها ڕۆژە چاوەڕوانیەتی. پێش ئەوەی بخەوێت، بەدڵخۆشییەوە هەڵسایە سەر پێ، لەو شوێنەوە کە لێی ڕاکشابوو ڕێی کرد بۆ کەناری دەریاچەکە، لە وێنەدانەوەی ئاوی دەریاچەکەدا سەیری سیمای خۆی کرد، جارێکی تریش تێگەیشتبوو کە دنیا لە جێی خۆیەتی.

دوای پێنج ڕۆژ، لە ئیستانبوڵ ئەوانەی عەبدی پاشا باش دەناسن، کاتێک کەللەکە لە توورەکەکەدا دەر دەهێنن، دەڵێن کەللەی ئەو نییە، کاتێک باس لە دەربڕینی سیما پێکەنیناوییەکە دەکەن، کە هیچ لە عەبدی پاشا ناچێت، جەللادەکە بیر لە سیما دڵخۆشەکەی خۆی دەکاتەوە، کە لە ئاوێنەی ئاوی دەریاچەکەدا بەئاسوودەییەوە سەیری کردبوو. چونکە دەیزانی هیچ سوودێکیشی نابێت، هیچ وەڵامی ئەو تاوانبارکردنانەشی نەدایەوە، کە گوایە بەرامبەر بە بەرتیلێک کە لە عەبدی پاشای وەر گرتووە کەللەی کەسێکی تری هێناوە، بۆ نموونە کەللەی شوانێکی بێگوناحی خستۆتە ناو توورەکەکەوە و هێناویەتی، دواتر بۆ ئەوەی ساختەچێتییەکەشی ئاشکرا نەبێت، سیماکەی شێواندووە، ئیتر ئەو جەللادەی دیبوو، کە دەبێت کەللەی لە جەستەی جیا بکاتەوە، وا لە دەرگاکەوە بۆی دێتە ژوور.

قسەوقسەڵۆکی ئەوەی لەجیاتیی کەللەی عەبدی پاشا کەللەی شوانێکی بێگوناح پەڕێنراوە، زۆر زوو بڵاو بووەوە، ئەوەندە زوو بڵاو بووەوە هەر کە جەللادی دووهەم نێردرا بۆ ئەرزوڕووم، عەبدی پاشای دروستکراو پێشوازیی لێ کرد، کە لە کۆشکەکەدا نیشتەجێ بوو، یەکسەر جەللادەکەی لەسێدارە دا. بەو شێوەیەش یاخیبوونی عەبدی پاشا دەستی پێ کرد، کە هەندێک بە سەیرکردنی شێوە و جووڵەی سیمایدا دەیانوت ساختەیە و دروستکراوە، یاخیبوونەکە بیست ساڵی خایاند و بووە هۆی پەڕاندنی شەش هەزار و پێنج سەد کەللە.

# خانی ئیرەیبەر و جوانی تەتەر

## [لە ڕۆمانی *من ناوم سوورەوە*.]

سەردەمێک لە باکووری هێرات، خانێکی گەنج هەبووە، کە لەسەر شاخێک، لەناو قەڵاکەیەکدا ژیاوە، مەراقی وێنەی هەبووە. ئەم خانە لەناو کچانی حەرەمەکەیدا تەنها یەک کچی خۆش ویستووە. دواتر ئەم کچە جوانی جوانانەی تەتەریش کە خان بەشەیداییەوە خۆشی ویستووە، عاشقی خان بووە. شەو تاکو بەیانی پێکەوە ئەوەندە خەوتوون، لەناو ئاو و عارەقەدا ئەوەندە دڵخۆش بوون، ویستوویانە ژیانیان تا کۆتایی بەو شێوەیە بەردەوام بێت. باشترین ڕێگەیەکیش بۆ ئەوەی ئەم مورادەیان بێتە دی، بیریان لەوە کردۆتەوە کە کتێبەکان بکەنەوە، چەندەها کاتژمێر، چەندەها ڕۆژ بێ وەستان سەیری ئەو وێنە بێهاوتا و جوانانە بکەن، کە نیگارکێشە لێهاتووە کۆنەکان نەخشاندویانن. تاکو سەیری ئەو وێنە بێهاوتایانەیان بکردایە، کە چیرۆکەکانیان هاوشێوەی یەکترن، هەستیان دەکرد کە زەمەن وەستاوە، دڵخۆشییەکەی خۆیان تێکەڵی ئەو زەمەنە دڵخۆشەی چاخە ئاڵتوونییە بووە

کە لە چیرۆکەکاندا دەگێڕدرێتەوە.

لەناو هۆڵی وێنەکێشەکانی خاندا، وێنەکێشێکی زۆر لێهاتوو هەبووە، کە بێ کەموکورتی سەرلەنوێ هەمان ئەو وێنانەی بۆ کتێبەکان نەخشاندووە. وەک نەریتێک وێنەکێشە لێهاتووەکە کە لە پەڕەکانی کتێبێکدا وێنەی ئازارچەشتنی فەرهادی لەبارەی عەشقەکەیەوە بۆ شیرین نەخشاندووە، یاخود یەکتربینینی لەیلێ و مەجنون و چاوبڕینەچاوی یەکتر بە حەسرەت و شەیداییەوە، یاخود شیرین و خەسرەوی لەناو باخە ئەفسانەییە بەهەشتئاساکەدا نەخشاندووە کە بە نیگا دووواتاییەکانیان لە یەکتری ورد دەبنەوە، لەجیاتیی عاشقەکان وێنەی خان و جوانی تەتەری نەخشاندووە. کاتێک خان و خۆشەویستەکەی سەیری ئەم پەڕانەیان کردووە، باوەڕیان کردووە کە دڵخۆشییەکەیان و عەشقەکەیان تێکەڵاوی پەڕەکانی ئەفسانە کۆنەکان بووە، بەتەواوەتی باوەڕیان کردووە کە عەشقەکەیان هەرگیز کۆتایی نایەت، نیگارکێشە لێهاتووەکەیان لەناو پیاهەڵدان و ئاڵتووندا نوقم کردووە.

لە کۆتاییدا زۆریی ئاڵتوون و پیاهەڵدان، وێنەکێشە لێهاتووەکەی لە ڕێگە لا داوە، بە تیۆەژەنینی ئەهریمەنیش بیری چۆتەوە کە قەرزاری وێنەکێشە لێهاتووە کۆنەکانە لە نەخشاندنی وێنە بێهاوتاکانیدا. بەشانازییەوە وای زانیوە ئەگەر بەگوێرەی کەسێتیی خۆی و شێوازی خۆی، وەک نوێگەرییەک لەناو وێنەکاندا دیمەنێک بنەخشێنێت لەو شتانەی کە خۆشی دەوێن، وەک: ئەسپ، سەرباز، عاشقەکان، باخەکان، باڵندەکان، ساتی شەو، زیاتر سەرنج ڕادەکێشێت و

پەسەند دەکرێت.

بەڵام خان و خۆشەویستەکەی نائاسوودە بوون، چونکە ئەم نوێگەرییانەیان وەک کەموکورتییەکی شوێنەواری شێواز و کەسێتیی وێنەکێشەکە بینیوە. چونکە ئەوان بەتەنها ویستویانە وەک خۆشەویستە کۆنەکانی ناو ئەفسانە کۆنەکان بن، ئەگەر وەک مرۆڤە کۆنەکان یان ئەفسانە کۆنەکان نەبن، ئەوکات باسکردنیان لەناو کتێبێکدا یان وێنەکێشانیان لەناو پەڕەیەکدا، هیچ واتایەکی نەبووە.

کاتێک خان بۆ ماوەیەکی زۆر سەیری وێنەکانی کردووە، هەستی کردووە کە دڵخۆشییە کۆنەکەیان لە وێنەکاندا تێک چووە و شێوێنراوە، ئیرەییی بە جوانی تەتەر بردووە، لەبەر ئەوەی سەرەتا وێنەی ئەو کێشراوە لەناو پەڕەکاندا. دواتر خان بۆ ئەوەی جوانی تەتەر بخاتە ناو هەستی ئیرەیییەوە، لەگەڵ کچێکی تری حەرەمەکەیدا خەوتووە. ئەمەش گەیشتۆتەوە گوێی خۆشەویستەکەی. کاتێک جوانی تەتەر لە قسەوقسەڵۆکی کچانی ناو حەرەمەوە ئەمەی زانیوە، ئەوەندە خەمباری کردووە، بەبێدەنگی خۆی هەڵواسیوە بە درەختە سەدیرەکەی ناو حەوشەی حەرەمەکەدا و خۆی خنکاندووە. خانیش، کاتێک درکی بە هەڵەکەی خۆی کردووە، بینیویەتی مەراقی شێواز و کەسێتی و نوێگەریی وێنەکێشەکە لەپشتی ئەم هەڵەیەوەیە کە کردوویەتی، هەمان ڕۆژ چاوەکانی ئەو وێنەکێشەی کوێر کردووە، کە ئەهریمەن هەڵی خەڵەتاندووە.

# فاخیر شا لەگەڵ سوڵتان نەریمان

[لە ڕۆمانی *من ناوم سوورەوە*.]

لەبەر ئەوەی هەموو شتێک، هەموو شتێک دووبارە دەکاتەوە، ئەگەر پیربوون و مردن نەبێت، مرۆڤ هیچ درک بەو شتە ناکات کە پێی دەوترێت زەمان، لە کۆنەوە تاکو ئێستا وەک بڵێی لە دنیادا هیچ زەمان نەبێت، هەر هەمان چیرۆک، بە هەمان وێنە، وێنەی کێشراوە، وەک سالیمی سەمەرقەندی، کە لە مێژووە کورتەکەیدا گێڕاویەتیەوە، سوپا بچووکەکەی فاخیر شا سەربازەکانی سەلاحەدین خانی پەریشان کرد.

دوای ئەوەی موزەفەر فاخیر شا سەلاحەدین خانی بەدیل گرتووە و لەژێر ئەشکەنجەدا کوشتوویەتی. وەک نەریتێک، یەکەم ئیش: سەردانی بوو بۆ کتێبخانە و حەرەمەکەی ڕەحمەتی، بۆ ئەوەی مۆری خۆییان لێ بدات. بەرگتێگرە بەئەزموونەکە، کتێبەکانی شا مردووەکەی هەڵوەشاند و دەستکاریی پەڕەکانی کرد، سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە دروستکردنیان، خۆشنووسەکان لە نووسراوەکاندا ناوی سەلاحەدین خانیان - کە هەموو کاتێک سەرکەوتوو بوو -

گۆڕیی بە موزەفەر فاخیر شا، نیگارکێشەکانیش جوانترین وێنەکانی سەلاحەدین خانیان لەناو کتێبەکاندا سڕیوەتەوە، کە هەر لە ئێستاوە لە بیرچوونەوەدا بووە، لە کاتێکدا کە ئەم وێنانە زۆر بە شێوازێکی لێهاتووانەش کێشرابوون، دواتر لە جێیاندا دەستیان کردووە بە دروستکردنی سیما گەنجەکەی فاخیر شا.

کاتێک فاخیر شا چووە حەرەمەکەوە، بێ هیچ ناڕەحەتییەک، یەکسەر جوانترین ژنی دۆزییەوە، بەڵام لەجیاتیی ئەوەی بەزۆر ببێت بە خاوەنی ژنەکە، لەبەر ئەوەی فاخیر شا لە کتێب و وێنە تێدەگەیشت و کەسێکی ناسک بوو، بڕیاری دا کە دڵخۆشی بکات و دڵی ژنەکە ڕاکێشێت بەلای خۆیدا، دەستی کرد بە قسەکردن لەگەڵیدا. بەو شێوەیەش نەریمان سوڵتانی چاوبەفرمێسکی جوانی جوانانی ژنی سەلاحەدین خان، یەک داخوازی لە فاخیر شا کرد، کە دەبووە مێردی نوێی. داخوازییەکەی ئەوە بوو، لەو کتێبەدا کە باس لە عەشقی لەیلێ و مەجنون دەکات، سیمای سەلاحەدین خانی مێردە ڕەحمەتییەکەی نەسڕێتەوە، کە وەک مەجنون کێشرابوو بەرامبەر نەریمان سوڵتانی ژنی کە لە وێنەکەدا وەک لەیلێ وێنەی کێشرابوو، داخوازیی لە فاخیر شا کرد کە بتوانێت بێ دریغی لە پەڕەکەیدا بیهێڵێتەوە و نەیسڕێتەوە. بۆ ئەوەی هیچ نەبێت مێردە ڕەحمەتییەکەی، ئەو هەقی نەمرییە بەدەست بهێنێت کە چەندەها ساڵ بە هۆی پێکهێنانی کتێبەکانەوە کاری بۆ کردووە.

موزەفەر فاخیر شا ئەم داخوازییەی بەدڵنەواییەوە پەسەند کرد، وێنەکێشەکانیش بەتەنها دەستکاریی ئەو وێنەیەیان نەکرد.

بەو شێوەیەش یەکسەر فاخیر و نەریمان پێکەوە خەوتن، لە ماوەیەکی کورتدا یەکتریان خۆش ویست، ترسناکیی ڕۆژانی ڕابردوویان بیر چووەوە، بەڵام فاخیر شا نەیتوانی ئەو وێنەیەی ناو کتێبی لەیلێ و مەجنونی بیر بچێتەوە. ئەو شتەی کە ئەوی نائاسوودە دەکرد، وێنەی ژنەکەی نەبوو لەگەڵ مێردە کۆنەکەیدا، یاخود ئیرەیی، نەخێر. ئەوەی کە ناخی دەکڕاندەوە ئەوە بوو، کە لەناو ئەفسانە کۆنەکاندا وێنەی نەکێشرابوو، لەناو کتێبە ناوازەکەدا لەگەڵ ژنەکەیدا نەچووبووە نێوان نەمرەکان و زەمانی بێکۆتاوە.

دوای ئەوەی ئەم کرمی گومانە بۆ ماوەی پێنج ساڵ ناخی کڕاندەوە، فاخیر شا لە کۆتاییی شەوێکی دڵخۆشدا کە بۆ ماوەیەکی زۆر لەگەڵ نەریماندا خەوتن، بە مۆمەکەی دەستیەوە وەک دزێک چوو بۆ کتێبخانەکەی خۆی، کتێبەکەی لەیلێ و مەجنونی کردەوە، لەشوێنی سیمای مێردە ڕەحمەتییەکەی نەریمان، کە وەک مەجنون کێشرابوو، دەستی کرد بە کێشانی سیمای خۆی.

بەڵام وێنەکێشێکی نەشارەزا بوو، وەک زۆرێک لەو خانانەی کە ئارەزوویان لە وێنەیە، نەیتوانی وێنەی سیمای خۆی بەباشی بکێشێت. بەو شێوەیەش بۆ بەیانیی ڕۆژی دواتر بەرپرسی کتێبخانەکە لەسەر گومانێک کە لەلای دروست ببوو، کاتێک کتێبەکەی کردەوە، لە جێگەی سیمای سەلاحەدین خان، سیمایەکی نوێی بینی لە بەرامبەر سیمای نەریماندا کێشراوە، ڕاگەیاندنی بڵاو کردەوە کە ئەم سیمایە نەک سیمای فاخیر شا، بەڵکو سیمای عەبدوڵا شای گەنج و قۆزی دوژمنی سەرەکیی فاخیر شایە.

هەر وەک چۆن ئەم قسەوقسەلۆکە ورەی سەربازەکانی فاخیر شای ڕووخاند، بویرییشی دا بە عەبدوڵا شای گەنج و پەلاماردەری دەسەڵاتداری نوێی مەملەکەتەکەی دراوسێی. ئەویش لە یەکەم جەنگدا فاخیر شای تێک شاند و بە دیل گرتی و کوشتی. مۆری خۆی دا لە کتێبخانە و حەرەمەکەی، بوو بە مێردی نوێی نەریمان سوڵتانی هەمیشەجوان.

# کاتێك وێنەکێش بەرەو کوێربوون دەچێت

**[لە ڕۆمانی *من ناوم سوورەوە*.]**

دەزانرێت کە سەردەمێک وێنەکێشە عەرەبەکان، لەبەر ترسی ئەزەلیی ئەوەی وێنەکێشەکان بە هۆی خەمی کوێربوونەوە، کاتێک خۆر ئاوا بووە بۆ ماوەیەکی زۆر سەیری ئاسۆی خۆرئاوایان کردووە، دوای سەدەیەکیش لە شیراز، زۆربەی نیگارکێشەکان بەیانییان بە سکی ناشتا کاکڵەگوێز و پەڕەی گوڵی کوتراویان خواردووە. دووبارە هەمان سەردەم، وێنەکێشە پیرە ئەسفەهانییەکان زۆربەی کات لە گۆشەیەکی نیمچەتاریکی ژوورەکەیاندا لەبەر ڕووناکیی مۆمدانەکانیاندا کاریان کردووە، بۆ ئەوەی تیشکی خۆر ڕێک لەسەر ئەو تەختانە نەدات کە کاریان لەسەر کردووە، چونکە ئەمەیان وەک هۆکارێکی ئەو کوێربوونە بینیوە کە بەڕیز بەسەریاندا هاتووە، هەر وەک چۆن تووشی نەخۆشیی تاعوون بوون، هەروەها لە بوخارا لە شوێنکاری وێنەکێشە ئوزبەکییەکاندا، لێهاتووەکان لە کۆتاییی ڕۆژدا بە ئاوێک چاوەکانیان دەشۆرد،

کە لەلایەن شێخەوە دوعای بەسەردا خوێنرابوو.

بە دڵنیایی ئەو شێوازەی لەناو ئەم هەموو شێوازانەدا، بە پوختی لە کوێربوون دەڕوانێت، ئەو شێوازەیە کە لە هێرات لەلایەن وێنەکێشی لێهاتوو سەید میرەکەوە دۆزراوەتەوە، لە هەمان کاتدا مامۆستای بەهزادی گەورە لێهاتوو بووە. بەگوێرەی میرەکی وێنەکێشی لێهاتوو، کوێربوون بەڵایەک نییە، کۆتا دڵخۆشییە کە خوا دەیدات بەو وێنەکێشەی کە هەموو ژیانی خۆی تەرخان کردووە بۆ جوانیی ئەو. چونکە وێنەکێشان، گەڕانی وێنەکێشە بەدوای ئەوەدا کە خوا دنیا چۆن دەبینێت، ئەم دیمەنە بێهاوتایە دوای کارکردنێکی زۆری وێنەکێش لە ژیاندا، کە بەتەواوەتی هیلاک دەبێت، چاوەکانی هیلاک دەبن و دوای ئەو کوێرییەی کە دەیگاتێ، تەنها بە یادکردنەوە دێتە دی.

کەواتە بەتەنها لە حافیزەی وێنەکێشە کوێرەکانەوە دەزانرێت کە خوا دنیا چۆن دەبینێت. پێشتر بە درێژاییی هەموو ژیانی دەستی ڕادەهێنێت، مەشق بە دەستی دەکات، بۆ ئەوەی کاتێک ئەم خەیاڵە دێتە مێشکی وێنەکێشێکی پیرەوە، واتە لەناو یادگارییەکان و تاریکاییی کوێریدا دیمەنی خوا دەر دەکەوێت، دەستی بە شێوەیەکی خۆڕسک وێنە بێهاوتاکە بکێشێت لەسەر کاغەزەکە.

بەگوێرەی مێژووناس، میرزا موحەمەد حەیدەر دوگلات، کە لەسەر وێنەکێشەکان و چیرۆکی پاڵەوانەکانی ئەو سەردەمەی هێرات نووسیویەتی، سەید میرەکی لێهاتوو نموونەیەکیشی داوە لەسەر وێنەکێشێک، کە دەیەوێت وێنەی ئەسپێک بکێشێت. بەم پێیە بێتواناترین وێنەکێشیش لەبەر ئەوەی ناو

مێشکی بەتەواوەتی بەتاڵە، ڕێک وەک وێنەکێشەکانی ئەمڕۆی ڕۆژئاوا، هەتا کاتێک بە سەیرکردنی ئەسپێک وێنەی ئەسپەکە دەکێشێت، وێنەکە بە هۆی حافیزەیەوە دەکێشێت، چونکە هیچ کەسێک ناتوانێت لە هەمان کاتدا هەم سەیری ئەسپەکە و هەم سەیری ئەو کاغەزە بکات کە وێنەی ئەسپەکەی لەسەر دەکێشێت. وێنەکێش سەرەتا سەیری ئەسپەکە دەکات، دواتر یەکسەر ئەوەی ناو مێشکی لەسەر کاغەزەکە دەکێشێت، هەتا ئەگەر لەو ماوەیەدا هێندەی چاوتروکانێک کات بڕوات، ئەوەی کە وێنەکێشەکە لەسەر کاغەزەکە کێشاویەتی ئەو ئەسپە نییە کە لە سەیرکردنیدایە، بەڵکو یادکردنەوەی ئەو ئەسپەیە کە کەمێک لەمەوبەر بینیویەتی، ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە کە بەتەنها بە حافیزە دەتوانرێت وێنە بکێشرێت، هەتا بەنیسبەت وێنەکێشێکی هەرە نەزانیشەوە.

وەک ئەنجامی ئەم بیرکردنەوەیە کە ژیانی پیشەیی چالاکیی وێنەکێش وەک ئامادەکارییەک دەبینێت بۆ یادگاریی کوێرەکان، دواتر بۆ ئەو کوێرییە دڵخۆشەی کە بەسەریاندا دێت، ئەو وێنانە وەک دەستڕاهاتنێک و مەشقێک دەبینێت کە ئەو سەردەمە لێهاتووەکانی هێرات بۆ شا کتێبدۆستەکان و شازادەکان کێشاویانە، کارکرن و هێڵکاریکردنی بێوچان، و چەندەها ڕۆژ بێ وەستان سەیرکردنی پەڕەی کتێبەکان لەبەر ڕووناکیی مۆمەکاندا وەک ئیشێکی دڵخۆشکەر پەسەند دەکرد، کە وێنەکێش دەبات بەرەو کوێربوون.

میرەکی وێنەکێشی لێهاتوو بە درێژاییی هەموو ژیانی بۆ ئەوەی کوێر ببێت و زوو لە کوێربوون نزیک ببێتەوە، هەندێک جار لەسەر نینۆک، یان لەسەر برنج، هەتا هەندێک

جار لەسەر تاڵەموو وێنەی درەختی کێشاوە بە گەڵاکانیەوە، هەندێک جاریش باخێکی خۆرەتاویی کێشاوە، هەمووکات گەڕاوە بەشوێن گونجاوترین کاتدا بۆ ئەوەی بگاتە ئەم کۆتا دڵخۆشییە. کاتێک حەفتا ساڵ بووە، سوڵتان حوسەین باکارا بۆ ئەوەی ئەم گەورە لێهاتووە خەڵات بکات، خەزێنەکەی خۆی بۆ کردۆتەوە، کە قفڵ لەدوای قفڵ لێی داوە، پەڕەی هەزارەها کتێبی بۆ واڵا کردووە، کە لە خەزێنەکەیدا کۆی کردۆتەوە و شاردوویەتیەوە.

میرەکی لێهاتوو لەبەر ڕووناکیی مۆمدانە ئاڵتوونییەکاندا لە ژووری خەزێنەکەدا کە پڕ بووە لە ئاڵتوون و قوماشی قەیفە و ئاوریشم و چەک، دوای ئەوەی سێ شەو و سێ ڕۆژ بێ وەستان سەیری پەڕەی ناوازەی کتێبەکانی لێهاتووە کۆنەکانی هێراتی کردووە کە هەریەکەیان ئەفسانەیەک بوون، کوێر بووە. دوای ئەوەی گەورەلێهاتوو وەک بڵێی پێشوازی لە پەرییەکی خوا دەکات، بەدڵفراوانی و پشتبەخوابەستنەوە پێشوازیی لەم بارە نوێیەی کردووە، ئیتر جارێکی تر هیچ قسەی نەکردووە، هیچ وێنەشی نەکێشاوە.

نووسەری *مێژووی ڕاشیدی*، میرزا موحەممەد حەیدەر دوگلات، ئەم دۆخە بە شێوەیەک باس دەکات کە وێنەکێشێکە گەیشتووە بە دیمەنە نەمرەکانی خوا، هیچ کاتێک ناگەڕێتەوە سەر پەڕەی ئەو کتێبانەی کە بۆ مرۆڤە ئاساییەکان دروست کراون و دەڵێت: لەو شوێنەدا کە یادگارییەکانی وێنەکێشە کوێرەکە گەیشتۆتە خوا، بێدەنگییەکی ڕەها و تاریکاییەکی دڵخۆشکەر و پەڕەی بەتاڵی بێکۆتاییی لێیە.

# من درەختێکم

**[لە *من ناوم سوورەوە*. لە ساڵی ١٥٩١دا، لە ئیستانبوڵ لە قاوەخانەیەکدا گێڕەرەوەیەک لە دەمی درەختێکەوە قسە دەکات کە وێنەکێشێک کێشاویەتی.]**

من درەختێکم، زۆر تەنهام، تاکو باران ببارێت من دەگریم. لەبەر ڕەزای خوا گوێ لەم شتانە بگرن کە دەیانگێڕمەوە. قاوەکانتان بخۆنەوە بۆ ئەوەی خەوتان بزڕێت و چاوەکانتان بکرێنەوە، زۆر بەوریاییەوە سەیرم بکەن، با بۆتانی بگێڕمەوە بۆچی ئەوەندە تەنهام.

١. دەڵێن بۆ ئەوەی لەپشتی گێڕەرەوە لێهاتووەکەوە وێنەی درختێکی لێ بێت، بە شێوەیەکی خێرا، بێ ئامادەکردنی کاغەزە ناقۆڵاکە وێنەم کێشراوە. ڕاستە، ئێستا لەتەنیشتمدا نە درەختی جوانی تر و نە گیای حەوت گەڵای چۆڵوهەرد، نە ئەو تاوێرە لوولەییە تاریکانەی کە هەندێک کات لە مرۆڤ و لە ئەهریمەن دەچن، نە هەوری پێچاوپێچی چینی بە ئاسمانەوەیە. تەنها من و زەوی و ئاسمان و هێڵی ئاسۆین، بەڵام چیرۆکەکەم تێکەڵاوترە.

٢. گرنگ نییە وەک درەختێک ئیللا ببم بە پارچەیەک لە کتێبێک. بەڵام نائاسوودە دەبم کە وەک وێنەی درەختێک پەڕەی هیچ کتێبێک نیم. ئەگەر لە کتێبێکدا شتێک پیشان نەدەم، ئەوکات ئەوە دێت بە مێشکمدا کە وێنەکەم بە دیوارێکەوە هەڵدەواسرێت و بتپەرستەکان و کافرەکان سوژدەم بۆ دەبەن و دەمپەرستن. با لایەنگرانی مامۆستا ئایینییەکانی ئەرزوروم گوێبیستی نەبن، بەڵام بەدزییەوە شانازی بەمەوە دەکەم، دواتریش بەشەرمەزارییەوە زۆر دەترسم.

٣. هۆکاری سەرەکیی تەنهاییشم ئەوەیە کە خۆیشم نازانم بووم بە پارچەی چ چیرۆکێک. دەبووم بە پارچەی چیرۆکێک، بەڵام لەوێوە وەک گەڵایەک کەوتمە خوارەوە. با ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە:

## چیرۆکی کەوتنەخوارەوەم لە چیرۆکەکەمدا، وەک گەڵایەک کە لە درەختەوە دەکەوێتە خوارەوە

تاهماسپی شای عەجەم، کە هەم دوژمنی سەرەکیی عوسمانی بوو، هەم یەکەم پاشای دنیا بوو کە ئارەزووشی لە وێنە بوو. چل ساڵ پێش ئێستا ئەم پیاوە خەڵەفا، شتانێکی زۆری لەبەرچاو کەوت، ئەو شتانەی سەرەتا دڵی لێیان سارد بوویەوە ئەمانە بوون: ڕابواردن، شەراب، موزیک، شیعر و وێنە. کە وازی لە قاوەش هێنا، مێشکی وەستا؛ بە مەراقی پیرە سیماگرژەکانەوە بۆ ئەوەی لە سەربازەکانی عوسمانی بەدوور بێت، لە تەبرێزی پایتەختەوە، کە ئەو سەردەمە موڵکی عەجەم بوو، گوێزرایەوە بۆ قەزوین. کاتێک زیاتر بەرەو پیربوون چوو، ڕۆژێک بە هۆی لێدانی خێوەوە کەوتە ناو قەیرانەوە و تۆبەی لە شەراب و مێردمنداڵبازی و وێنەکێشان کرد، ئەمەش سەلمێنەری ئەوە بوو کە ئەم شا بڵندە دوای وازهێنانی لە قاوە، عەقڵە ساغەکەشی لەدەست دابوو.

بەو شێوەیەش ئەو پەنجا بەرگتێگر و خۆشنووس و وێنەکێشانەی لە تەبرێز کە بیست ساڵە گەورەترین کارە جوانەکانی جیهان دەکەن، بە شارەکاندا پەرشوبڵاو بوونەوە. سوڵتان ئیبراهیم میرزا، کە هەم برازای شا تاهماسپ، هەم زاوای بوو، لێهاتووەکانی بانگهێشت کرد بۆ مەشهەد[1] کە

١ مەشهەد: شارێکە لە ئێران.

تێیدا والی بوو، ئەوانی لە شوێنکاری وێنەکێشانەکەی خۆیدا جێگیر کرد و دەستی کرد بە دروستکردنی کتێبێکی زۆر ناوازە بە نەخش و وێنەوە، هەروەها پێنووسینەوەی *حەوت مەسنەوییەکەی* جامی، کە لە سەردەمی تەیموردا گەورەترین شاعیر بووە لە هێرات. شا تاهماسپ، کە برازا عاقڵەکەی هەم خۆش دەویست، هەم ئیرەیی پێ دەبرد، پەشیمان بوو لەوەی کە کچەکەی خۆی دابوویە، کاتێک گوێبیستی ئەم کتێبە ناوازەیە بوو، کەوتە حەسوودیبردن و بەرقەوە برازاکەی لە والیی مەشهەدەوە دوور خستەوە بۆ شاری کاین، دواتر دووبارە بە رقێکی نوێوە دووری خستەوە بۆ شاری سەبزەوار، کە شارێکی بچووکتر بوو. بەو شێوەیەش خۆشنووس و وێنەکێشەکانی مەشهەد پەرشوبڵاو بوونەوە بۆ شاری تر، مەملەکەتی تر، شوێنکاری وێنەکێشانی سوڵتان و شازادەکانی تر.

بەڵام بە پەرجوویەک[1] کتێبە ناوازەکەی سوڵتان ئیبراهیم میرزا لە نیوەیدا پەکی نەکەوت؛ چونکە کتێبزانێکی ڕاستەقینەی هەبووە. ئەم پیاوە سواری ئەسپەکەی دەبێت و دەچێت بۆ شیراز، لەبەر ئەوەی باشترین وەستای بەئاڵتوونکردن - نەخشاندن بە ئاڵتوون- لەوێیە، لەوێوە دوو پەڕە هەڵدەگرێت و دەچێت بۆ ئەسفەهان بۆ لای خۆشنووسێک، کە زۆر بەجوانی دەتوانێت بە شێوازی نەستەعلیق[2] بنووسێت، دواتر شاخەکان دەبڕێت و دەچێت بۆ بوخارا، ڕێکخستنی وێنەکە بەو وێنەکێشە لێهاتووە گەورەیە دەکات کە لای خانی

---

١ پەرجوو: موعجیزە.

٢ نەستەعلیق: شێوازێکی نووسینە.

ئۆزبەک وێنە دەکێشێت، وێنەی مرۆڤەکانی پێ دەکێشێت، دواتر دەچێتە هێرات و ئەم جارەیان وێنەی گیا و گەڵا لوولخواردووەکان بەئەزبەر بە یەکێک لە وێنەکێشە لێهاتووە کەمبیناکان دەکێشێت؛ لە هێرات سەردانی خۆشنووسێکی تر دەکات، نووسینی تابلۆی سەر دەرگای ناو وێنەکەی بە نووسینی ڕوقعەی ئاڵتوونی پێ دەنووسێت، دواتر سەرلەنوێ بەرەو باشوور دەچێت و دەگەڕێتەوە بۆ کاین، دوای گەشتە شەش مانگییەکەی پەڕە نیوەتەواوکراوەکەی دەبات بۆ سوڵتان ئیبراهیم میرزا، پیشانی دەدات و ئافەرینەکەی وەر دەگرێت.

کاتێک تێگەیشتن ئەگەر کارەکە بەو شێوەیە بڕوات، ئەوا ناتوانن هەرگیز کتێبەکە تەواو بکەن، کەوتنە بەکارهێنانی هەواڵنێری تەتەری. لەگەڵ ئەو پەڕەیەدا کە دەبێت کاری لەسەر بکرێت و نووسینی لەسەر بنووسرێت، یەکێ نامەیەکیشیان دایە دەستیان، کە پێناسەی ئەو شتانەی تێدا بووە کە لە هونەرمەندەکەیان ویستووە. بەو شێوەیەش ئەو هەواڵنێرانەی کە پەڕەی کتێبەکەیان هەڵگرتبوو بە هەموو وڵاتانی عەجەم و مەملەکەتی خۆراسان و ئۆزبەک، لە ڕێگەکانی ماوەرائەلنەهردا تێپەڕین. هەر وەک خێراییی هەواڵنێرەکان، دروستکردنی کتێبەکەش خێراییی وەر گرت. هەندێک جار هەڵگری پەنجاونۆهەمین پەڕە لەگەڵ هەڵگری سەد و شەستودووهەم پەڕەدا لە شەوێکی بەفردا و لە کاروانسەرایەکدا کە لوورەی گورگەکانی لێوە دەبیسترا یەکترییان دەبینی، کاتێک هاوڕێیەتییان دەکرد، تێدەگەیشتن کە بۆ دروستکردنی هەمان کتێب کار دەکەن، پەڕەکانیان

لـە ژوورەکەیانـەوە دەهێنـا و بەگوێـرەی یەکتـری کاریـان دەکرد، بۆ ئـەوەی تێبگـەن شـوێنی ئـەو پەڕانـەی کە هێناویانـە، دەکەوێتـە کوێـی یەکێـک لـە مەسـنەویەکانەوە.

دەبوایـە لەنـاو پەڕەیەکـی ئـەو کتێبـەدا بوومایـە کـە ئەمـڕۆ بەخەمبارییـەوە گوێبیسـتی تەواوبوونـی بـووم. بەداخـەوە لـە ڕۆژێکـی زسـتانی سـارددا چەتـەکان ڕێگەیـان بـەو هەواڵنێـرە تەتـەرە گـرت کـە لەنێـوان تاوێرەکانـەوە ڕێـی دەکـرد و منـی هەڵگرتبوو. لەپێشدا لـە تەتـەرە بەدبەختەکەیـان دا و دواتر وەک کـرداری هەمـوو چەتەیـەک ڕووتیـان کـردەوە دەسـتدرێژییان کردە سـەری و بێدینانـە کوشـتیان. لەبـەر ئـەوە منیـش نازانـم کەوتوومەتـە کام پەڕەوە. داوا لـە ئێوە دەکـەم سـەیرم بکـەن و ئەمـەم پێ بڵێن: بڵێی بووبـم بـە سـێبەرێک بۆ مەجنوون، کە بە پۆشـاکی شـوانییەوە سـەردانی لەیلێ دەکات لـە چادرەکەیدا؟ بۆ ئـەوەی تاریکاییی ڕۆحـی نائومێدێکی بێبـاوەڕ ڕوون بکەمـەوە؛ تێکـەڵاوی نـاو تاریکیـی شـەو دەبـووم؟ دەمویسـت هاوبەشـیی دڵخۆشـیی دوو خۆشەویسـت بکـەم، کـە بـە هەڵهاتنیـان لـە هەمـوو دنیـا، دەریاکانیـان تێپەڕانـدووە و لـە دوورگەیەکـی پڕ لـە باڵنده و میوەدا ئاسـوودەییيان دۆزیوەتـەوە! دەمویسـت ببـم بـە سـێبەرێک بۆ دواسـاتەکانی ئیسـکەندەر، کاتێـک هیندسـتانی ڕزگار کـرد، بـە خـۆر کـەوت و چەندەهـا ڕۆژ خوێـن لـە لووتیـەوە هـات و مـرد، یاخـود دەبـووم بـە نیشـانەی تەمـەن و هێزی باوکێـک کـە عاشـقی کوڕەکەیەتـی و ئامۆژگاریـی دەکات لەبـارەی ژیانـەوە؟ واتـا و جوانیـم دەبەخشـییە کام چیـرۆک؟

یەکێـک لـەو چەتانـەی کـە هەواڵنێرەکەیـان کوشـت و منیـان لەگەڵ خۆیاندا هەڵگرت، شـاربەشـار و شـاخبەشـاخ دەیانگەڕاندم،

هەندێک جار بەهای منی دەزانی، هێندەی تێگەیشتنی ئەوەی کە سەیرکردنی وێنەی درەختێک جوانترە لە سەیرکردنی درەختەکە خۆی، بەناسکی هەڵسوکەوتی دەکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی نەیدەزانی کە ئەم درەختە پارچەی کام چیرۆکە، زوو بێزار دەبوو لێم. دوای ئەوەی منیان شاربەشار گەڕاند، ئەم چەتەیە، وەک ئەوەی من لێی دەترسام، نەیدڕاندم و فڕێی نەدام، لە خانێکدا منی فرۆشت بە پیاوێکی هەستناسک، بەرامبەر بە گۆزەیەک شەراب. ئەم پیاوە هەستناسکە بەدبەختە، هەندێک جار شەوانە دەگریا و لەبەر ڕووناکیی مۆمێکدا سەیری منی دەکرد. کاتێک لە خەمباریدا مرد و شمەکەکانیان فرۆشت. لە سایەی گێڕەرەوە لێهاتووەکەوە کە منی کڕی، تاکو ئیستانبوڵ هاتم. ئێستا زۆر دڵخۆشم و جێی شەرەفە بۆ من کە ئەمشەو لێرە لەنێوان وێنەکێشەکان و خۆشنووسە دەستوپەنجە پەرجوو و چاوهەڵۆ و ئیرادەپۆڵایین و مەچەکناسکەکانی پاشای عوسمانیدام، بۆ خاتری خوا، لێتان دەپاڕێمەوە، بۆ ئەوەی باوەڕ بەوانە نەکەن کە دەڵێن وێنەکێشێکی لێهاتوو منی بەخێرایی لەسەر کاغەزێکی خراپ کێشاوە بۆ ئەوەی بە دیوارێکەوە هەڵواسرێت.

سەیر کەن چەند درۆ و چەند بوختان و چەند قسەهەڵبەستنی بێشەرمانە هەیە! بیرتانە دوێنێ شەو ئوستازەکەم وێنەی سەگێکی بێرەدا هەڵواسیبوو، بەسەرهاتەکانی ئەم سەگە بێئەدەبەی کردبوو بە چیرۆک و لەو کاتەشدا بەسەرهاتەکانی مامۆستا خوسرەتی خەڵکی ئەرزڕوومی گێڕابووەوە! ئێستا خۆشەویستانی حەزرەتی مامۆستا نوسرەت بەهەڵە لەمە گەیشتوون؛ گوایا ئێمە قسەی ڕەق دەدەین بە ڕوویدا. ئێمە

دەتوانین بە حەزرەتی ئامۆژگاریکەرە گەورەکە بڵێین کە کەس نازانێت باوکی کێیە؟ حاشا! ئەگەر شتێکی وا بێت بە مێشکماندا؟ ئەمە چ جۆرە فیتنەیەکە، چەند قسەوباسێکی بێشەرمانەیە! مادام خوسرەتی خەڵکی ئەرزورووم لەگەڵ نوسرەتی خەڵکی ئەرزورووم‌دا تێکەڵ دەبێت، با من چیرۆکی درەختی مامۆستا نەدرەتەی خێڵی سیواسیتان بۆ بگێڕمەوە.

ئەم مامۆستا نەدرەتە خێڵە سیواسییەش جگە لەوەی نەفرەتی لە مێردمنداڵبازی و وێنەکێشان کردبوو و وتبووی قاوە کاری ئەهریمەنە و ئەوەی بیخواتەوە دەچێتە جەهەننەم. ئێ باشە سیواسیی، تۆ بیرت چۆتەوە کە لقە گەورەکەی من چۆن خوار بووەوە؟ با بۆ ئێوەی بگێڕمەوە، بەڵام سوێند بخۆن کە بە هیچ کەسێک نەڵێن، خوا بمانپارێزێت لە بوختان. بەیانییەکیان کە سەیرم کرد پیاوێکی باڵامنارە و چنگشێرئاسای وەک دێو، لەگەڵ ئەوەی کە لە سەرەوە ناوی هاتووە، چوونەتە سەر ئەم لقەی من، لەنێوان گەڵا چڕەکانیدا خۆیان شاردۆتەوە، ببورن، بەڵام خەریکی یەکتری بوون. کاتێک پیاوە دێوئاساکە، کە لەدواتردا تێگەیشتم ئەهریمەنە و خەریکی ئەوەی ئێمە بوو، هەم بەخۆشەویستییەوە ماچی گوێچکەی دەکات، هەم دەچرپێنێت بە گوێچکەیدا دەڵێت، "قاوە حەرامە، قاوە گوناحە..." ئەمەی کە بڕوای بە زیانەکانی قاوە هەیە، باوەڕی بە فەرمووده جوانەکانی دینەکەمان نییە، باوەڕی بە ئەهریمەنە، ئیتر خۆتان تێبگەن.

وەک دواشتیش باسی وێنەکێشە ڕۆژئاواییەکان دەکەم، بۆ ئەوەی ئەگەر ناڕەسەنێک هەبێت بیەوێت لاسایی ئەوان بکاتەوە، پەند وەر بگرێت. ئەم وێنەکێشە ڕۆژئاواییانە بە

شێوەیەکی وەها وێنەی سیمای پاشا و قەشە و بەگ و هەتا ژنەکانیان دەکێشن، دەتوانیت بە سەیرکردنی وێنەکە ئەو کەسە لە کۆلاندا بناسیتەوە. ژنەکانی ئەمانە خۆی لەخۆیدا لە کۆلانەکاندا بەئازادی دەگەڕێن، ئیتر ئەوی تری خۆتان بیری لێ بکەنەوە. بەڵام ئەمەش بەس نەبووە، کارەکانیان زیاتر پەرە پێ داوە. لە گەوادیدا نا، لە وێنەکێشاندا دەڵێم...

وێنەکێشێکی لێهاتووی ڕۆژئاوایی لەگەڵ وێنەکێشێکی لێهاتووی تردا لە سەوزاییەکی ڕۆژئاوادا ڕێ دەکەن، لەسەر لێهاتوویی و هونەر قسەیان کردووە. دارستانێکیان لەپێشیانەوە بینیوە. ئەوەی کە زیاتر لێهاتوو بووە بەوی تریانی وتووە، "وێنەکێشان بە شێوازی نوێ دەستڕەنگینییەکی ئەوەندەی پێویستە، هەر کە وێنەی درەختێک لە درەختی ناو ئەم دارستانەت کێشا، ئەو بەمەراقەی کە سەیری وێنەکە دەکات، ئەگەر بییەوێت دەتوانێت بێت بۆ ئێرە، ئەو درەختە لە درەختەکانی تر جیا بکاتەوە و بیدۆزێتەوە."

من هەزارم، وێنەی ئەو درەختەم کە دەیبینن، شوکری خواکەم دەکەم، لەبەر ئەوەی بەو عەقڵە وێنەم نەکێشراوە. ئەگەر بە شێوازی ڕۆژئاواییەکان وێنەم بکێشرایە، دەترسام، نەک بڵێم لەوە دەترسام کە هەموو سەگەکانی ئیستانبوڵ وایان دەزانی درەختێکی ڕاستەقینەم، میزیان پێدا دەکردم. لەبەر ئەوەی من نەک درەختەکە خۆی، بەڵکو دەمەوێت واتاکەی بم.

# خەوتان لێ ناکەوێت؟

**[لە کتێبی *ڕەشــ*ـەوە. جەلال سالیک دەیگێڕێتەوە.]**

چوونــە جێگەکەتانــەوە. لەنێـوان ئــەو شــمەکانەی کــە ئاشــنان پێیــان، لەنێـوان ســەرچەف و پەتۆکانـدا جێگیـر بــوون، کــە پــڕە لــە بۆنــی خۆتــان و یادگارییەکانتــان، ســەرتان نەرمیــی سـەرینەکەتانی دۆزییەوە کە هەمـوو کات ئاشـنایە پێی، خۆتـان وەر گێڕا بـە لادا، کاتێـک ئەژنۆکانتـان نووسـاند بـە سـنگتانەوە، سـەرتان بـەرەو پێشـەوە دانەواند، ڕووە ساردەکەی سـەرینەکە ڕوومەتتانی فێنک کردەوە: کەمێکی تر، کەمێکی تر دەخـەون، لەنـاو تاریکاییـدا، هەمـووی، هەموویتـان بیـر دەچێتـەوە.

هەموویتــان بیــر دەچێتــەوە: هێــزە بێبەزەیییەکــەی ئەوانــەی لــە ئێــوە باڵاتــرن، ئــەو قســانەی بــێ بیرکردنــەوە کـراون، کەللەپووتییـەکان، ئـەو کارانــەی تەواوتـان نەکـردووە، نەگونجاندن، ناپاکی، ناهەقی، فەرامۆشـکردن، ئەوانـەی ئێوەیـان تاوانبـار کـردووە و دەیکـەن، بێپارەیی، تێپەڕینـی کات بەخێرایی، وەسـتانی کات، ئـەو شـتانەی پێی نەگەیشـتوون، تەنهاییەکەتان، شــەرمەکەتان، دۆڕاندنەکانتــان، بەدبەختییەکەتــان، دۆخــی

بەئازارتان، بەلاکانتان، هەموو بەلاکان، هەموویتان کەمێکی تر بیر دەچێتەوە. چاوەڕوانن. لەبەر ئەوەی بیرتان دەچێتەوە، ئاسوودەن. لەگەڵ ئێوەدا شمەکەکانی دەروبەریشتان، دۆلابە ئاشناکانی ناو تاریکییەکە، یاخود نیمچەتاریکییەکە، چەکمەجەکان، زەیتییەکان، مێزەکان، تەپلەکەکان، کورسییەکان، پەردە دادراوەکان، ئەو جلوبەرگانەی کە داتان کەندووە و فڕێتان داوە، پاکەتە جگەرەکەتان، شقارتەی ناو چاکەتەکەتان و جانتاکەی دەستتان، سەعاتەکەتان؛ ئەوانیش چاوەڕوانن.

کاتێک چاوەڕوانی دەکەن، گوێتان لە دەنگی ئاشنا دەبێت؛ ڕۆشتنی ئوتومبێلێک کە بەسەر بەردڕێژی کۆڵانەکەتاندا، بەسەر گۆمەئاوی کەنار ڕێگەکەدا، بە گەڕەکەکەتاندا تێپەڕ دەبێت، دەنگی داخستنی دەرگایەک لە کۆلانێکی نزیکەوە، ماتۆڕی سەلاجە کۆنەکەتان، زۆر لە دوورەوە وەڕەی سەگەکان، دەنگی هۆڕنلێدان کە بە هۆی باری تەمەوە لە دوورەوە لە کەناری دەریاوە دێت، داخستنی ناوەختی دەرابەی محەلەبیخانەکە. بە بانگهێشتکردنی خەو و خەوبینین، ئەم دەنگە پڕ لە یادگارییانە، کە دەرگایەکە دەکرێتەوە بەرەو دنیای نوێی بیرچوونەوە دڵخۆشەکەدا، بیرتان دەخاتەوە کە کەمێکی تر ئەوانیشتان وەک شمەکەکانی دەورووبەرتان، لەگەڵ جێگە خۆشەویستەکەتاندا بیر دەچێتەوە، دەچن بۆ دنیایەکی تر، هەموو شتێک ئاسایی دەبێت، ئامادەن.

ئامادەن؛ وەک بڵێی دوورکەوتنەوە لە جەستەتان، لە قاچە خۆشەویستەکەتان، جومگەی ڕانتان، هەتا لە دەست و قۆڵە نزیکەکانتان. ئامادەن، لەبەر ئەوەی ئامادەشن ئەوەندە ئاسوودەن کە جەستەتان پێویستی بە یارمەتیی ئەم پارچە

نزیکانە نییە، کاتێک چاوەکانتان دادەخرێت دەزانن کە کەمێکی تر ئەوانیشتان بیر دەچێتەوە.

دەزانن بە جووڵەیەکی نەرمی ماسوولکە، بیلبیلەی چاوتان لەژێر چاوە داخراوەکانتاندا بەتەواوەتی لە ڕووناکی دوور کەوتۆتەوە. وەک بڵێی بیلبیلەکانی چاوەکانتان دەزانن بە هۆی بۆن و دەنگە ئاشناکانەوە هەموو شتێک بەباشی بەڕێوە دەڕوات، ئێستا نەک ڕووناکییە نادیارەکەی ناو ژوورەکەتان، بەڵکو وەک ڕەنگەکانی فیشەکەشێتەیەک ڕووناکییەکەی ناو سەرتان پیشانی ئێوە دەدات، کە تا دەڕوات هێور دەبێتەوە، ئاسوودە دەبێت: پەڵەی شین، هەورەبرووسکەی شین، دووکەڵی مۆر، گومەزی مۆر دەبینن؛ جووڵەی شەپۆلی شینی نیلی، سێبەری مۆری کاڵی تاڤگەکان، ڕژانی شلەی گرکانی ڕەنگ ئەرخەوانیی شاخە بورکانییەکان، ڕەنگی شینی ساردی ئەستێرەکان دەبینن کە بەبێدەنگی دەدرەوشێنەوە. ڕەنگەکان و دیمەنەکان کە بە ونبوونیان و دووبارە دەرکەوتنیان و گۆڕانیان بەهێواشی، بەبێدەنگی، یەکتری دووبارە دەکەنەوە، هەندێک برگە کە بیر چوونەتەوە، هەندێک برگە کە هیچ رووی نەداوە، هەندێک یادگاری پیشانی ئێوە دەدەن؛ سەیری ڕەنگەکانی ناو مێشکتان دەکەن.

بەڵام خەوتان لێ ناکەوێت.

هێشتا زۆر زوو نییە بۆ ئەوەی دان بەم ڕاستییەدا بنێیت؟ ئەو شتانە بهێنن بە مێشکی خۆتاندا کە لە زەمانێکدا بیرتان لێ کردۆتەوە و بەئاسوودەیی خەوتوون: نەخێر، نەک ئەمڕۆ چیتان کردووە، یاخود بەیانی چی دەکەن، بە ڕۆیشتن بەناویاندا بیر لەو ساتە شیرینانە بکەنەوە کە ئێوە

دەگەیەنێتە بیرچوونەوەی ناو خەو: ئیتر ئەوەتا کاتێک هەموو کەس چاوەڕوانی گەڕانەوەی ئێوەیە، دواجار دەگەڕێیتەوە، زۆر دڵخۆش دەبن؛ نەخێر هیچ ناگەڕێیتەوە، لەگەڵ شمەکە هەرە خۆشەویستەکانتاندا کە لەناو جانتاکەی دەستاندایە لە شەمەندەفەرێکدان کە لەنێوان عەمودی تەلەفۆنی بەفراوییەوە ڕێ دەکات، کاتێک ئەو وشە جوانانە دەڵێن کە بە مێشکتاندا دێت، وەڵامی زیرەکانەیان دەدەنەوە، هەموویان هەڵەکانیان تێدەگەن، بێدەنگ دەبن، ئەگەر بەنهێنییش بێت بەرامبەر ئێوە شەیداییەکیان تێدایە؛ باوەش دەکەیت بە جەستە جوانە خۆشەویستەکەتدا، ئەو جەستەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باخەی کە ناتوانن بیرتان بچێتەوە، بە هۆیەوە گێلاسی پێگەییوو لە لقەکان دەکەیتەوە. هاوین دێت، زستان دێت، بەهار دێت؛ بەیانی دێت، بەیانییەکی شین، بەیانییەکی جوان، بەیانییەکی خۆرەتاو، بەیانییەکی دڵخۆش... بەڵام نەخێر، خەوتان لێ ناکەوێت.

ئەوکات وەک من بکەن: بێ ئەوەی هیچ قۆڵ و قاچتان نائاسوودە بکەن، بەهێواشی بیانجووڵێنن و کەمێک لە جێگەکەتاندا وەر بگەڕێن، با سەرتان بچێتە ئەوسەری سەرینەکە، ڕوومەتتان گۆشەیەکی فێنک بدۆزێتەوە. دواتر بیر لە شازادە ماریا پێلیولۆجینا بکەنەوە، کە حەوت سەد ساڵ پێش ئێستا لە بیزەنتەوە وەک بووکێک نێردراوە بۆ هۆلاکۆی دەسەڵاتداری مەغۆل. لەم شارەوە کە ئێوەی تێدا دەژین، لە قۆنستانتینۆ پۆلیسەوە نێردراوە بۆ ئێران، بۆ ئەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ هۆلاکۆدا بکات، بەڵام پێش ئەوەی بگاتە ئەوێ، هۆلاکۆ دەمرێت، ئەویش لەگەڵ ئاباکای

کوڕیدا هاوسەرگیریی کردووە، کە لە جێی باوکی چۆتە سەر تەخت، پانزە ساڵ لە ئێران، لە سەراکەی مەغۆلدا ژیاوە، کاتێک مێردەکەی دەکوژرێت، گەڕاوەتەوە بۆ ئەو گردانەی[1] کە ئێوەش دەتانەوێت بەئاسوودەیی لەسەری بخەون. لە ناختاندا بیر لە خەمباریی کەوتنەڕێی گەڕانەوەی شاژن ماریا بکەنەوە، تاکو بەباشی هەستی پێ دەکەن، بیر لەو ڕۆژانەی بکەنەوە کە لەو کڵێسەیەدا بەسەری بردووە کە دوای گەڕانەوەی لە کەناری هالیچدا[2] دروستی کردووە، خۆی تێدا حەپس کردوە. بیر لە کورتەباڵاکانی سوڵتان هاندان بکەنەوە. دایکی سوڵتان ئەحمەدی یەکەم بۆ ئەوەی ئەم دۆستە کورتەباڵایانەی دڵخۆش بکات، کە زۆری خۆش دەوێن، ماڵێکی بۆ دروست کردوون لە ئوسکودار[3]، دواتر ئەم دۆستە باڵاکورتانەی کە چەندەها ساڵ لەم ماڵەدا ژیاون، سەرلەنوێ بە یارمەتیی سوڵتان هاندان کەشتییەکیان دروست کردووە، کەشتییەکەیان دابەزاندووەتە ناو دەریا، بۆ ئەوەی پێی بچن بۆ وڵاتێکی نەزانراو، بەهەشتێک کە خۆشیان لەناو نەخشەدا نەیاندۆزیوەتەوە، دواتر دوور کەوتوونەتەوە لە ئیستانبوڵ. ئێوەش وەک بڵێی کەمێکی تر جیا دەبنەوە لە ئیستانبوڵ، لە کەسە زۆر خۆشەویستەکانتان، بیر لە خەمباریی سوڵتان هاندان بکەنەوە کە دادەبڕێت لە دۆستەکانی، بیر لە دڵتەنگیی کورتەباڵاکان بکەنەوە، کاتێک

---

١ گرد: لێرەدا مەبەستی ئیستانبوڵە، چونکە ئیستانبوڵ ناوێکی تریشی هەیە، کە پێی دەڵێن: "یەدی تەپە،" واتە حەوت گرد.

٢ هالیچ: بەشێکە لە ئاوی دەریای مەڕمەڕە، کە وەک دەریاچەیەک درێژ بۆتەوە و ئەوسەری دەر ناچێت، لە بەری ئەورووپای ئیستانبوڵدایە.

٣ ئوسکودار: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئاسیا لە کەنار دەریادا.

لە بەیانیی گەشتەکەیاندا لە کەشتییەکەوە دەستەسڕیان بۆ با داوە.

خوێنەرە خۆشەویستەکانم، ئەگەر ئەمانەش من نەخەوێنێت، بیر لە پیاوێکی بێئارام دەکەمەوە، کە لە شەوێکی تەنهادا لە وێستگەیەکی تەنهادا بە ڕێکردنی بۆ ئەمسەر و ئەوسەر، چاوەڕوانی شەمەندەفەرێکە کە هەر نایەت؛ کاتێک بڕیار دەدەم کە پیاوەکە بۆ کوێ دەڕوات، من بووم بەو پیاوە. بیر لەو کەسانە دەکەمەوە کە لە دەروازەی سلیڤری[1] لەژێر زەویدا کاریان کردووە بۆ هەڵکەندنی تونێل، بۆ ئەوەی یارمەتییەک بێت بۆ یۆنانییەکان کە حەوت سەد ساڵ لەمەوبەر ئیستانبوڵیان داگیر کردووە. بیر لەو پیاوە پەشۆکاوە دەکەمەوە، کە دووهەم واتای ماددەکانی دۆزیوەتەوە. بیر لەو دنیایەی دووهەم دەکەمەوە کە لەناو دنیادا والاّ دەبێت، کاتێک دووهەم واتای هەموو شتێک بەهێواشی ڕوون دەبێتەوە لەم دنیا نوێیەدا، بیر لەوە دەکەمەوە کە لەنێوان واتاکاندا چۆن سەرخۆش دەبم. بیر لەو سەرسامییە دڵخۆشەی ئەو پیاوە دەکەمەوە کە حافیزەی خۆی لەدەست داوە. بیر لەوە دەکەمەوە کە جێ هێڵراوم لە شارێکی خێویدا کە هیچ پێی ئاشنا نیم؛ هەموو شتێک، هەموو شوێنێک چۆڵوهۆڵە، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەردەمێک ملیۆنەها مرۆڤی تێدا دەژیان، گەڕەکەکان، شەقامەکان، مزگەوتەکان، پردەکان، کەشتییەکان چۆڵن، تاکو ڕێ بکەم لەو پانتاییە خێوییە چۆڵانەدا لەگەڵ فرمێسکی چاوەکانمدا ڕابردووی خۆم و شارەکەی خۆمم دێتەوە یاد، بەهێواشی ڕێ دەکەم

[1] سلیڤری: شارۆچکەیەکە لە ئیستانبوڵ لە بەری ئەورووپا.

بەرەو گەڕەکەکەی خۆم، ماڵەکەی خۆم، بۆ ئەو جێگەیەی کە دەمەوێت تێیدا بخەوم. بیر لەوە دەکەمەوە کە فرانچۆیس چیمپالیۆنم کاتێک بۆ ئەوەی نووسینی هیرۆگلۆفیی سەر بەردی ڕۆسێتا شی بکاتەوە، لە جێگەکەیدا هەڵساوە، بە خەیاڵڕۆشتنی ئەوانەی کە لە خەودا دەگەڕێن، لە ڕاڕەوی ناخی خۆیدا گەڕاوە، چۆتە ناو کۆڵانە دەرنەچووەکانەوە، ڕێکەوتی یادگارییە تەواوبووەکانی کردووە. بیر دەکەمەوە چوارەمین موورادم، کە شەوێکیان پۆشاکی خۆی گۆڕیوە و لە سەراکەی هاتۆتە دەرەوە بۆ پشکنینی قەدەغەکردنی مەشروب، کاتێک لەگەڵ پاسەوانەکانمدام، کە ئەوانیش پۆشاکیان گۆڕیوە، بەو متمانە شاراوەیەی کە کەس زیانم پێ ناگەیێنێت، بەخۆشەویستییەوە دەست دەکەم بە سەیرکردنی ژیانی کۆیلەکانم لەناو مزگەوتەکاندا، لەو دوکانانەدا کە هێشتا تاک کراوەن، لەو تەمبەلانەی لە ڕاڕەوە نهێنییەکەندا بەبێ ئیشوکار دانیشتوون.

دواتر بووم بە شاگردی لێفەدروویێک کە لە نیوەی شەودا دەرگابەدەرگا دەگەڕێت، برگەی سەرەتا و کۆتاییی ئەو کۆدە نهێنییە بەچرپە دەداتە کاسبکارەکان، وەک ئامادەکارییەک بۆ یەکێک لە یاخیبوونەکانی سەربازەکانی عوسمانی لە سەدەی نۆزدەهەمدا. یاخود هەواڵنێرێکی خوێنەرم ئەو کەسانە بەخەبەر دێنمەوە لە خەودا، لەو بێدەنگییەی کە چەندەها ساڵ دەخایەنێت، کە لایەنگری تەریقەتێکی قەدەغەکراون، بە عەشقی خوا عەقڵیان لەدەست داوە.

خوێنەرە خۆشەویستەکانم، ئەگەر هەر خەوم لێ نەکەوتبێت، دەبم بە عاشقێکی نائومێد، کە بەدواداچوون بۆ

یادگارییەکانی دەکات و دەگەڕێت بۆ سیمای خۆشەویستە ونبووەکەی، هەموو دەرگایەکی شارەکە دەکەمەوە، لە هەموو ئەو ژوورانەدا کە تریاکی تێدا دەکێشرێت، لە هەموو ئەو کۆڕانەدا کە چیرۆکیان تێدا دەگێڕدرێتەوە، لە هەموو ئەو مالانەدا کە گۆرانییان تێدا دەوترێت، دەگەڕێم بۆ ڕابردووی خۆم و شوێنپێی خۆشەویستەکەم. لە کاتی ئەم گەشتە دوورودرێژانەمدا ئەگەر یادگەم یان هێزی خەیاڵم یان خەیاڵەکانم، کە ڕاپێچ دەبێت لێرەوە بۆ ئەوێ، هیلاک نەبێت و هێشتا کۆڵ نەدات، لە کۆتاییدا لەنێوان خەو و بەئاگاییدا لە یەکێک لەو ساتە نادیارە دڵخۆشانەدا دەچم بۆ شوێنێکی ئاشنا کە یەکەم جار دێتە بەردەمم، ماڵی دۆستێکی دوورم، یاخود کۆشکی خزمێکی نزیکم، کە بەچۆڵی ماوەتەوە، وەک بڵێی پشکنین بۆ ئەو گۆشە لەبیرکراوانەی ناو یادگەم بکەم، یەک بە یەک دەرگاکانی دەکەمەوە، دەچمە ئەو ژوورەی لە کۆتاییدا دۆزیومەتەوە، مۆمەکە دەکوژێنمەوە، لە جێگەکەدا ڕادەکشێم، لەنێوان شتە سەیر و نامۆ و دوورە نائاشناکاندا دەخەوم.

# دایکم، باوکم و ونبوونیان

## [ لە کتێبی *ئیستانبوڵەوە*. نووسەر دەیگێڕێتەوە]

هەندێک جار باوکم دەچوو بۆ شوێنێکی دوور. بۆ ماوەیەکی زۆر ئەومان نەدەبینی. بە شێوەیەکی سەیر نەیاندەهێشت هەست بەم سەرەتای نەبوونییەی بکەین. کاتێک بەئازارەوە بەتەواوەتی درکمان بە نەبوونی کرد، هەستیشمان دەکرد کە لە زووەوە بەم نەبوونییەی ڕاهاتووین، وەک چۆن دوای ماوەیەک پێی دەزانرێت کە پاسکیلێک ون بووە، یاخود دزراوە، یاخود وەک هاوڕێیەکی پۆلەکەت کە ئیتر نایەت بۆ قوتابخانە. ڕوونکردنەوەیەک نەدەدرا لەبارەی ئەوەی کە باوکمان بۆچی ون بووە، زانیارییەکیشیان نەدەدا بە ئێمە کە ئایا ئەم دۆخە کەی کۆتایی پێ دێت. من و کاکی گەورەم، هەستمان دەکرد کە پێویستە ئەم جۆرە پرسیارانە نەکەین، بە شێوەیەکی ئاسان خۆمان دەگونجاند لەگەڵ باری کەسەکانی ناو ماڵەکەدا. ڕاستە ئەم کەموکورتییەمان بیر نەدەچووەوە. بەڵام لەبەر ئەوەی لە ئەپارتمانێکی گەورەدا لەگەڵ مامەکانم، پوورەکانم، دایکی باوکم، چێشتلێنەر و خزمەتکارەکەدا

هەموو پێکەوە دەژیاین بە شێوەیەکی قەرەباڵغ، بێ ئەوەی پرسیار بکەین، تێپەڕاندنی ئەم دۆخەی لەلا ئاسان دەکردین. هەندێک جار خەمباریی ئەو شتەی کە بیرمان چووبووەوە بە باوەشپێداکردنی پڕخۆشەویستی ئێسما خانی خزمەتکاردا، یان بەکری چێشتلێنەری دایکی باوکمدا(نەنکم)، تێدەگەیشتین لەبەر ئەوەی هەرچییەکمان داوا دەکرد یەکسەر بۆی جێبەجێ دەکردین، یاخود بە پێداگریی زۆری مامە ئایدندا کە بەیانییانی یەکشەممان بە ئوتومبێلە دۆجە مۆدێل ٥٢کەی ئێمەی دەبرد بۆ پیاسەی گەروو.

هەندێک جاریش بەوەدا هەستم دەکرد کە دۆخمان خراپە، کاتێک دایکم بەیانییان بە تەلەفۆن لەگەڵ پوورەکانم و هاوڕێکانیدا، یاخود لەگەڵ دایکیدا بۆ ماوەیەکی زۆر قسەی دەکرد. دایکم ڕۆبە درێژە ڕەنگ کرێمییە گوڵمێخەکە سوورەکەی لەبەردا بوو، کاتێک لەسەر کورسییەکە دادەنیشت لەبەر ئەوەی قاچی دەخستە سەر قاچ، کە ڕۆبەکەی بە جووڵەی هەمەچەشنە شۆڕ دەبووەوە بۆ خوارەوە و مێشکمی تێکەڵ دەکرد، لەنێوان بۆشاییەکەوە گەردنی و پۆشاکە تەنکەکەی ژێرەوەیم دەبینی، کە وەک پێستی جوان بوو، کاتێک ئەو بە تەلەفۆن قسەی دەکرد، دەمویست بچمە باوەشیەوە و نزیک ببمەوە لە قژ و گەردن و مەمکەکانی و سینەوبەرۆکە ناسک و جوانەکەی. دوای چەندەها ساڵ، دوای ئەوەی کە لەسەر سفرەی نانخواردنەکەمان لەگەڵ باوکمدا دەمەقرەیەکی گەورەیان کرد، ئارەزووم لەو کەشە خراپە بوو کە شەڕەکانی نێوان دایکم و باوکمان سەپاندبوویان بەسەر ماڵەکە و ئێمەشدا، وەک چۆن خۆیشی بەتووڕەییەوە

ڕێک بە خۆمی وتبوو.

کاتێک چاوەڕوانی ئەو ساتەم دەکرد دایکم پەیوەستم بێت، لە بەردەمی مێزتوالێتەکەیدا دادەنیشت، کە سەرەکەی پڕ بوو لە شووشەعەتر و بۆدرە و سووراو و بۆیەی نینۆک و قۆلۆنیا و گوڵاو و ڕۆنی بادەم، بەتامەزرۆییەوە چەکمەجەکانی دەکردەوە، خۆی سەرقاڵ دەکرد بە مووکێشی جۆراوجۆر و مقەست و بڕبەنگی نینۆک و قەڵەمی چاو و فڵچەی شێوەقەڵەمی و شانە و ئامێری نووکتیژەوە، سەیری وێنەکانی منداڵیی من و کاکمی دەکرد کە ئاخنرابوونە نێوان سەری مێزەکە و شووشەکەی سەری - دایکم بە هەمان ڕۆبەوە، کاتێک لەسەر کورسییەکە دای نیشاندووم و ڕەقەمێک شیرم دەداتێ، هەردووکمان بەدڵخۆشییەوە پێدەکەنین، کە بەتەنها لە ڕێکلامی شیری منداڵاندا ڕێکەوتی دەکەیت - بیرم دەکردەوە چۆن دەنگی ئەو قیژەی خۆشییە لە وێنەکەدا دەر نەچووە کە لە ساتی وێنەگرتنەکەدا لێم داوە.

بۆ ئەوەی لەو خەمباری و بێزارییە ڕزگارم ببێت، کە بەهێواشی لە ناخمدا جێگیر دەبوون، دەستم دەکرد بە یارییەک کە هیچ لێم نەدەزانی دوای چەندەها ساڵ هاوشێوەیەکی لە ڕۆمانەکانمدا دەنووسم. شووشەکانی هەردوو لای ئاوێنەی مێزتوالێتەکەی دایکم، فڵچەکانی قژی، قوتووە زیوە بەکلیلداخراوەکەی گوڵی بەرجەستەکراوی لەسەر دروست کرابوو و هیچ کاتێک نەدەکرایەوە، ڕێک دەمهێنانە ناوەڕاستی مێزەکەوە، سەرمم نزیک دەکردەوە لە ناوەڕاستی ئاوێنەکە، کاتێک لەناکاو هەردوو لاتەنیشتی ئاوێنەکەم دەکردەوە، ئەوەندەی بتوانم خۆم لەنێوانیاندا بمێنمەوە، هەزارەها ئۆرهانم

دەبینی کە دەجوولانەوە لە ناکۆتایەکی ڕەنگ شووشەی قووڵ و ساردا لەناو ئەو ئاوێنانەی کە ئاوێنەکان لەنێوان خۆیاندا زۆریان کردبوون. کاتێک سەیری دیمەنە هەرە نزیک و گەورەکەم دەکرد، بەشەکانی پشتەوەی سەرم، کە هیچ ئاشنا نەبووم پێی و پشتەسەری تیژ و شێوەهێلکەییم، سەمەرەییی گوێچکەکانم کە یەکێکیان لەوی تریان ڕەپتر بوو، وەک گوێچکەی باوکم، منی سەرسام دەکرد. لەوەش سەیرتر بینینی پشتی ملم بوو، کە هەموو جارێک تاکو ئێستاش بەڕاچڵەکینەوە بیری لێ دەکردمەوە، ئەو شتەی پێی دەڵێن جەستە، شتێکە وەک بڵێی چەندەها ساڵە کەسێکی نامۆم لەگەڵ خۆمدا هەڵگرتبێت. نەک تەنها لادیمەنەکەم لەنێوان سێ ئاوێنەدا کە خۆشبەختی دەکردم، بەڵکو ئەو دەیەها و سەدەها ئۆرهانە جیاوازە بەشانازییەوە منیان خۆشبەخت دەکرد، کە هەریەکەیان بە گۆشەیەکی بچووک دەگۆڕان، هەریەکەیان لەوی تر جیاواز، لە یەک ساتدا لاساییی جوولەیەکی دەستمیان دەکردەوە وەک کۆیلەیەک. جوولەی هەمەچەشنەم پێ دەکردن، تاکو قاییل دەبووم بەوەی کە هەریەکەیان کۆیلەیەکن. هەندێک جار لە ناکۆتای شووشە سەوزباوەکەدا هەوڵم دەدا کە دوورترین ئۆرهان بدۆزمەوە. هەندێک جار وام دەزانی کە دیمەنە لاساییکەرەوەکانم، نەک لە هەمان ساتدا لاسایی جوولەیەکی دەستم، یاخود سەرم دەکەنەوە، بەڵکو دوای تێپەڕبوونی ساتێکی زۆر کەم لاساییم دەکەنەوە. ترسناکترینیان ئەوە بوو کاتێک ڕوومەتەکانم پڕ دەکرد لە هەوا، برۆکانم گرژ دەکرد، زمانم دەر دەهێنا و یاریم بە سیمام دەکرد. یاخود کاتێک سەرنجی هەشتەم

یان دەهەم ئۆرهانی گۆشەیەکم دەدا لەناو سەدەها ئۆرهاندا، جوولەیەکی بچووکی ئاسانی قۆڵەکانی خۆم، کە بوونیانم بیر چووبووەوە، جوڵەی پەنجەکانم کە بەخۆڕسک دەیانکرد، لەناو قووڵاییە سەوزباوەکەی دەریا ئاوێنەکاندا، لە هەمان ساتدا لاساییکردنەوەی دە-پانزە ئۆرهانی بچووک پێکەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی ئاگاداری ئەو جوولە بچووکانەی دەستم نەبووم، بۆ ساتێک وام دەزانی کۆمەڵێک لەو ئۆرهانە دوورانە لەنێوان خۆیاندا ڕێک کەوتوون پێکەوە و ئیتر خۆیان بۆخۆیان جوولە دەکەن. لە پێشدا دەترسام، دوای ئەوەی بەو بەشەی مێشکم کە زۆر لۆژیکییە، قبوڵم دەکرد کە ئەمە هەڵەتێکەیشتنێکە، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بکەومەوە ناو هەمان ترسەوە، بەردەوام دەبووم لە یاریکردن. دواتر کاتێک بەتەنها بە پێوەری یەک پەنجە ئاوێنەکانم لە شوێنی خۆیاندا دەجووڵاند و گۆشەکانیانم دەگۆڕی، ئەم جارەیان منیان ڕووبەڕووی ڕیزێک ئۆرهانی زۆر جیاوازتر دەکردەوە. هەر وەک چۆن لە کونی ئامێرێکی فۆتۆوە سەیر دەکەیت و بۆ ساتێک سەیرکردنی خاڵێکی ناوەندت لێ تێک دەچێت، لەنێوان ئەم ئۆرهانە ناکۆتایانەدا بۆ ساتێک دڵخۆش بووم کە بەبێچارەییەوە بگەڕێم بەدوای شوێنی نزیکترین و یەکەم دیمەن لەگەڵ شوێنی ڕاستەقینەی خۆمدا (وەک بڵێی ئەویشم ون کردبێت).

هەندێک جار لە کاتی یارکردنماندا لەگەڵ دایکم و کاکی گەورەمدا، کە بە هۆی ئەم "ونبوونە"ی باوکمەوە دەکرا و هەموو ڕۆژێک بۆ ماوەیەکی زۆر دڵخۆشی دەکردم، سەرەڕای ئەوەی یادگەم بەئاگایانە ئەو زانیارییانەی فەرامۆش دەکرد،

که دەیزانی بەرگەی زانینیان ناگرم، بە شێوەیەکی هەڵبژاردە بیرم دەکردەوە لە گفتوگۆکانی دایکم کە لە تەلەفۆنەکەدا دەری دەبڕین، باوکم لەکوێیە، کەی دەگەڕێتەوە، یاخود ڕۆژێک دایکیشم ون دەبێت.

چونکە هەندێک جار دایکیشم ون دەبوو، بەڵام کاتێک کە ئەو ون دەبوو، ڕوونکردنەوەیەک دەدرا، بۆ نموونە دەوترا، "دایکتان نەخۆشە، لای پوورە نەریمان پشوو دەدات." بیرمە ئەگەر کاتییش بووبێت، ئەم ڕوونکردنەوانەم بە پەسەند دەزانی، وەک چۆن دەمتوانی بە نیەتێکی باشەوە خۆم هەڵخەڵەتێنم بەرامبەر بەشێک لەو هەڵەتێگەیشتنەی ناو ئاوێنەکان. چێشتلێنەرەکەی دایکی باوکم، یاخود ئیسماعیل ئەفەندیی دەرگاوانیان لەگەڵماندا دەنارد و بە پاس یاخود کەشتی دەچووین بۆ سەرێکی تری ئیستانبوڵ بۆ سەردانی دایکم، بۆ نموونە ماڵی خزمێکمان لە ئەرەنکوێی[1]، یاخود بۆ ئیستینییە[2] بۆ ماڵی کەسێکی تر. لە کۆتاییی هەموو ئەم گەڕانانەدا، بەدەر لە خەمباری، چێژی سەرکێشی لە مێشکمدا دەمایەوە. ئەو باوەڕە منی دەپاراست کە کاکی گەورەم لەتەنیشتمدایە، پێش من ئەو ڕووبەڕووی کێشەکان دەبێتەوە. هەندێک لەو خزمە دوور و نزیکانەی دایکم کە بەسەردان دەچووین بۆ ماڵەکانیان، دوای ئەوەی پوورە بەبەزەییە پیر و ڕۆحسووکەکان و مامە تووکاوییەکان، کە بەلای منەوە ترسناک بوون، خۆشەویستییان بۆمان دەردەبڕی و دەستیان دەهێنا بە سەرماندا، لە ماڵەکەدا شتێک سەرنجی ڕادەکێشاین،

---

١ ئەرەن کویی: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئاسیا.

٢ ئیستینییە: گەڕەکێکە لە کەنار دەریا، لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئەورووپا.

كه‌نارییه‌ك كه‌ به‌رده‌وام ده‌یخوێند، بارۆمه‌ترێكی ئه‌ڵمانی، كه‌ وام ده‌زانی سه‌ردانی هه‌موو ئه‌و ماڵانه‌ی ئیستانبوڵ ده‌كه‌ن كه‌ بوون به‌ ڕۆژئاوایی - ژن و مێردێك له‌ناو پۆشاكی لادێییه‌كی باڤیه‌رادا، به‌گوێره‌ی كه‌شی ئاووهه‌وا ده‌چوونه‌ ماڵان - یاخود دوای ئه‌وه‌ی ئه‌و سه‌عاته‌یان پیشان ده‌داین كه‌ باڵنده‌ ته‌خته‌یه‌كه‌ی ناوی هه‌موو نیوكاتژمێر جارێك وه‌ك ئاماژه‌یه‌ك ده‌یخوێند، وه‌ك وه‌ڵامدانه‌وه‌یه‌ك بۆ كه‌نارییه‌كه‌ی ناو قه‌فه‌زه‌كه‌، كه‌ به‌رده‌وام له‌ جووڵه‌دا بوو، دواتر ئێمه‌ ده‌چووین بۆ ژووره‌كه‌ی دایكم.

دوای ئه‌وه‌ی سه‌رسام ده‌بووین به‌ گه‌وره‌یی و دۆخی ئاسووده‌به‌خشیی ژووره‌كه‌، جوانیی دیمه‌نی ده‌ریا و ڕووناكییه‌كه‌ی كه‌ له‌ په‌نجه‌ره‌كه‌یه‌وه‌ ده‌بینرا، به‌ڵكو له‌به‌ر ئه‌وه‌ش بوو هه‌موو كات ئاره‌زووم له‌ دیمه‌نه‌كانی باشوور بوو، كه‌ له‌ په‌نجه‌ره‌كه‌ی ماتیسه‌وه‌ ده‌بینرا، به‌خه‌مبارییه‌وه‌ سه‌یر بوو له‌لام كه‌ دایكم له‌ شوێنێكی وه‌ها جوان و نامۆدایه‌، به‌ڵام چه‌ند كه‌لوپه‌لێكی ئاشنای ئارایشتكردنی سه‌ر مێزه‌كان وه‌ك هه‌مان مووكێش و شووشه‌ی عه‌تر و فڵچه‌ی قژه‌كه‌ی كه‌ پۆلیشی پشته‌كه‌ی لێ ببووه‌وه‌، ئه‌و بۆنه‌ بێوێنه‌ی دایكم، كه‌ له‌گه‌ڵ چه‌ند كه‌لوپه‌لێكدا ژووره‌كه‌ی پڕ كردبوو، متمانه‌یه‌كی ده‌دا پێم. به‌ هه‌موو ورده‌كارییه‌كانیه‌وه‌ بیرمه‌ كه‌ دایكم چۆن من و كاكمی ده‌كرده‌ باوه‌شی و ده‌ستی ده‌هێنا به‌ سه‌رماندا و خۆشه‌ویستیی بۆمان ده‌ر ده‌بڕی. چه‌ند ئامۆژگارییه‌كی ده‌دا به‌ كاكم - هه‌موو كات ئاره‌زووی له‌ ئامۆژگاریكردن بوو - وه‌ك: ئه‌و ئیشانه‌ی ده‌بێت بكرێت، ئه‌و قسانه‌ی ده‌بێت بوترێن، ئه‌و ڕێگایانه‌ی ده‌بێت بگیرێنه‌ به‌ر و

چۆنێتیی هەڵسوکەوتکردن، بۆ نموونە: لەبارەی ئەوەی ئەگەر جارێکی تر بیینەوە لە چ دۆلابێکدا چ کەلوپەلێک هەڵبگرێت و بۆی بهێنێت، کاتێک - سەرەی منیش - دەهات، کە هیچ گوێم لەم گفتوگۆیانەیان نەدەگرت و لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، دەستی دەکرد بە سوعبەت و یاریکردن لەگەڵمدا.

لەو ڕۆژانەدا کە بۆ جارێکی تریش دایکم لە ماڵ نەبوو، باوکم دادەیەکی هێنایەوە بۆ ماڵەوە. پێستی زۆر سپی بوو، بالای کورت، خڕپلانە و دوور لە جوانی، هەموو کات پێدەکەنی، بەسەرمەشقییەکەوە، کە شانازیی پێوە دەکرد، ئامۆژگاریی ئێمەی دەکرد، کە چی بکەین و چی نەکەین، وەک ئەو پێبکەنین، بە پێچەوانەی ئەوەی لەناو هەندێک خێزانی ناسیاودا هەیە، لەگەڵ کاکمدا هیچ ئارەزوومان لەم ژنە نەبوو، لەبەر ئەوەی تورک بوو، دەبوویە هۆی نائومێدیمان. کە تێگەیشت ناتوانێت وەک زۆرینەی دادە ناسیاوە بەئەسڵ ئەڵمان و ڕۆحپرۆتەستانەکان "دەسەڵات" بسەپێنێت بەسەرماندا، کاتێک لاساییمان دەکردەوە، زۆرانبازیمان دەکرد لە ماڵەکەدا نائاسوودە دەبوو دەیوت، "تکاتان لێ دەکەم، بەهێمنی، بەجوانی." باوکم پێدەکەنی، ئیتر ئەم ژنە لە ماوەیەکی کەمدا ڕۆیشت و دیار نەما. لە ساڵەکانی دواتردا کاتێک دایکم بەتەواوەتی بێزار دەبوو لە نەبوونی باوکم، لە زۆرانبازیی من و کاکم و توورە دەبوو، کە بەنائومێدییەوە دەیوت، "سەری خۆم هەڵدەگرم، دەڕۆم" یاخود "لەو پەنجەرەیەوە خۆم هەڵدەدەمە خوارەوە." جارێکیان یەکێک لە قاچە جوانەکانی بردبووە بەر پەنجەرەکە، "ئیتر باوکیشتان

لەگەڵ ئەو ژنەدا هاوسەرگیری دەکات." ئەوکات من ئەو دادە پێست سپی و خڕپلانە و نیەتباشە دەهات بە خەیاڵمدا، نەک ژنێک لەو ژنانەی کە دایکم هەندێک جار بەتووڕەییەوە ناوی دەهێنا وەک دایکێکی کاندیدکراو، کە زۆربەی کاتیش هیچ باسی لێ نەدەکرد.

سەرەڕای ئەوەی لە هەمان ئەپارتمان، هەمان ژوور و هەمان کۆلاندا دەژیاین، وەک چۆن دواتر باوەڕم دەکرد کە لە خێزانێکی ڕاستەقینەشدا هەمان دۆخ هەیە، سەرەڕای ئەوەی ژیانێکمان بەسەر دەبرد، کە هەمووکات لەسەر بابەتی هاوشێوە قسە دەکرا، هەمان خواردنیش دەخورا، جگە لە چەند گۆڕانکارییەکی بچووک (دووبارەبوونەوە سەرچاوەی دڵخۆشییە، گەرێنتی و مردنیەتی!) ئەم "ونبوونانەی" کە هیچ نەدەزانرا کەی، لەکوێوە دێت، زیاد لەوەی کە منی خەمبار دەکرد، لەناو سات و ڕۆژە بێزارکەرەکانی ژیانێکی سادەدا دەری دەهێنام - وەک ئاوێنەکانی مێزتوالێتەکەی دایکم - وەک گوڵە ژەهراوییە سەرسووڕهێنەرە ئاسوودەکەرەکان، یەکسەر منیان دەبرد بۆ ناو دنیایەکی تر. ساتەکانی ئەم "ونبوونانە،" کە دەنگی دەدا بە سووچێکی تاریکی ڕۆحم، منیان سەرقاڵ دەکرد، زیاتر وای لێ دەکردم کە هەست بە بوونی خۆم و ئەو تەنهاییەم بکەم کە دەمویست بیرم بچێتەوە، لەبەر ئەوە بە هۆی نەگبەتی و شەڕی خێزانییەوە زۆر کەم دەگریام.

ئەم شەڕانە زۆربەی کات لەسەر سفرەی نانخواردن دەستی پێ دەکرد. لە ساڵەکانی دواتردا ئەو ئۆتومبێلەی - ئۆپڵ ڕێکۆردە مۆدێل ١٩٥٩ - کە باوکم کڕیی، زیاتر بووە شوێنی دەستپێکردنی شەڕەکان، چونکە بە پێچەوانەی سفرەی

نانخواردنەوە، کە شەڕکەرەکان دەیانتوانی هەستن لەسەری، لەم ئوتومبێلەدا نەدەکرا دابەزن، لە کاتێکدا بە خێراییەکی زۆر دەڕوات. هەندێک جار کاتێک کە شەڕ دەستی پێ دەکرد هێشتا لە یەکەم خولەکی گەشتێکدا کە چەندەها ڕۆژ پلانی بۆ کێشراوە، یاخود لە پیاسەیەکی سادەی گەرووی ڕۆژانی یەکشەممماندا، لەگەڵ کاکمدا گرەومان دەکرد: ئایا باوکم دوای پردی یەکەم، یاخود دوای یەکەم بەنزینفرۆش بە ئیستۆپێکی توندەوە پێچ دەکاتەوە و دەمانباتەوە بۆ ماڵەوە، وەک کاپتنی کەشتییەک کە بارەکەی بەتووڕەیییەوە دەباتەوە بۆ ئەو بەندەرەی کە لێوەی بار کردووە، خۆیشی بە ئوتومبێلەکەیەوە دەچێت بۆ شوێنێکی تر.

لە یەکێک لەو شەڕانەی سالانی یەکەمدا کە زیاتر لایەنێکی شیعرئاسا کاریگەرییەکی قووڵی هەبوو لەسەری، ئەوە بوو کە لە دوورگەی هەیبەلی[1] دایکم و باوکیشم لەسەر سفرەی نانخواردنەکە هەڵسان. وەک هەموو منداڵێک ئاسوودە بووم، لەبەر ئەوەی خۆم چۆنم دەویست بەو شێوەیە نانەکەم خوارد، نەک بە شێوازی ویستی دایکم. لە نهۆمی سەرەوە بە هەموو هێزیان هاواریان دەکرد بەسەر یەکتردا، دوای ئەوەی لەگەڵ کاکمدا لەسەر مێزەکە بەبێدەنگی سەیری بەردەمی خۆمانمان دەکرد، بە سروشتی ئێمەش چووینە سەرەوە بۆ لای ئەوان. (لێرەدا کە سەرلەنوێ پەراوێزێک هات بە مێشکمدا، بە سروشتی تێگەیشتم کە بە هیچ شێوەیەک نامەوێت ئەم چیرۆکانەم بیر بکەوێتەوە.) کاتێک دایکم بینیی لەگەڵ کاکمدا لە گەرمەی دەمەقاڵێکەیاندا چووینە ژوورەوە،

---

[1] دوورگەی هەیبەلی: دوورگەیەکە نزیک شاری ئیستانبول.

یەکسەر هەردووکمانی برد بۆ ژوورێکی تر، دەرگاکەی لەسەر داخستین. ژوورەکە تاریک بوو، بەڵام لە دوو شووشە سەهۆڵییەکەی دەرگا گەورە دووتاکییەکەوە کە ژوورەکانی لە یەکتر جودا کردبۆوە، ڕووناکییەک بە شێوەیەکی ڕێک دەهاتە ژوورەوە. من و کاکم بێ ئەوەی هیچ جووڵە بکەین لەو ڕووناکییەی کە لە شووشە نەخشدارە سەهۆڵییەکانەوە دەهاتە ژوورەوە، دەستمان کرد بە سەیرکردنی سێبەری دایکم و باوکم کە لەناو هاتوهاوار و قیژەدا لە یەکتری نزیک دەبوونەوە و دوور دەکەوتنەوە. لە توندوتیژیی ئەم یاریی سێبەرە فرمێسکڕژێنەدا، جارجارێک پەردەکە - دەرگای شووشە سەهۆڵییەکە - دەلەرییەوە، هەموو شتێک ڕەشوسپی بوو، هەر وەک چۆن لە قەرەگۆیزدایە[1].

[1] قەرەگۆیز: یەکێکە لە کارەکتەرەکانی یاریی سێبەری بووکەڵەی تورکی، ئەم یارییە لە پشتی پەردەیەکەوە کە ڕووناکیی لێ دراوە، دوو کەس بە بووکەڵەکانی دەستیانەوە ڕۆڵ دەبینن کە سێبەرەکانیان لەمدیوی پەردەکەوە دیارە و تەماشاکەر دەیبینێت، کارەکتەرەکانیش یەکێکیانی ناوی حاجی واتە، ئەوی تریان ناوی قەرەگۆیزە.

# نارەحەتی و خۆشییەکانی قوتابخانە

[ لە کتێبی *ئیستانبولەوە*.]

ئەو شتەی بۆ یەکەم جار لە قوتابخانە فێری بووم، ئەوە بوو کە هەندێک کەس گەمژەن، دووەم شتیش کە فێری بووم، هەندێک کەس زۆر زیاتر گەمژەن. لەبەر ئەوەی لەو تەمەنەمدا تێنەگەیشتبووم ئەگەر بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەیت وەک بڵێی درکت نەکردبێت بەو جیاوازییە بنچینەیی و دیاریکەرانەی وەک دین، ڕەگەز، ڕەچەڵەک، چین، سەروەت (کە لە دواتردا خرایە ناو ئەم لیستەوە) کولتوورە جیاوازەکان، کامڵبوون و ناسکی و بەڕێزییەکە، هەموو جارێک مامۆستا لە پۆلدا کە پرسیاری دەکرد، بۆ ئەوەی پیشانی بدەم کە وەڵامە ڕاستەکە دەزانم، بە پەلەقاژێوە پەنجەم بەرز دەکردەوە.

لە مانگ و ساڵەکانی دواتردا، ئەمە بوو بە ڕاهاتنێک. مامۆستاش و پۆلەکەش کەمێک تێگەیشتبوون کە خوێندکارێکی باش و عاقڵم، بەڵام من بۆ ئەوەی بیسەلمێنم بۆ هەموو پرسیارێک وەڵامێکم هەیە، بەردەوام پەنجەم بەرز دەکردەوە. مامۆستا زۆر کەم هەڵی دەساندم، زۆر جار ئاماژەی بە

پەنجەکانی تر دەدا کە بەرز بوبوونەوە بۆ ئەوەی ئەوانیش قسە بکەن. دوای ماوەیەک بە شێوەیەکی خۆڕسک بۆ هەموو پرسیارێک پەنجەم بەرز دەبووەوە، وەڵامەکەی بزانم یاخود نەیزانم. لەمەدا هەستکردنی شێوە خواستێکی هاوکاریکردن و شەیدایی هەبوو بەرامبەر مامۆستا، بە ویستێکی خۆدەرخەرەوە، وەک چۆن کەسێک کاتێک پۆشاکێکی ئاسایی لەبەر دەکات، دەیەوێت وا دەر بکەوێت کە پۆشاکێکی زۆر گرانی پۆشیوە، یاخود بە بۆینباخبەستن دەیەوێت وەک دەوڵەمەندێک دەر بکەوێت.

چونکە شتێکی تریش کە لە قوتابخانە بە خۆشەویستی درکم پێ کردبوو، فێری ببووم هێزی مامۆستا بوو وەک "دەسەلاتێک." قەرەباڵغی خێزانیی ناو ئەپارتمانی پاموک، دۆخێکی پەرشوبڵاو و پارچەپارچەی هەبوو، لە نانخواردنە قەرەباڵغەکاندا هەریەکە قسەیەکی دەکرد، وەک بڵێی خۆشەویستی، هاوڕێیەتی خێزانەکە لەگەڵ یەکدا، پێویستی گفتوگۆکردنی قەرەباڵغییەکە، نانخواردن، کاتەکانی گوێگرتن لە ڕادیۆ، بە شێوەیەکی خۆڕسک بەستراببوونەوە بەو ڕاهاتن و یاسایانەوە کە کەس نەیدەتوانی مناقەشەیان بکات. باوکم لە ماڵەوە وەک ناوەندێکی هێز هیچ دەسەلاتدار نەبوو، کەم دەبینرا، جارجارێک دیار نەدەما. لەوەش گرنگتر بە هیچ شێوەیەک سەرزەنشتی من و کاکی گەورەمی نەدەکرد، هەتا برۆکانیشی گرژ نەدەکرد کاتێک شتێکمان بکردایە کە بەدڵی نەبووایە. لە ساڵەکانی دواتردا کاتێک باوکم ئێمەی بە هاوڕێکانی ناساند، وتی، "ئەمانەش دوو برا بچووکەکەی منن" بەڕاستی حەقی بوو. چونکە لە ماڵەوە بەتەنها دایکمم

وەک "دەسـەڵاتێک" ناسـیبوو. بـەڵام هـۆکاری ئـەو هێـزەی دایکـم لەسـەر مـن، بـەدەر لـە "دەسـەڵاتێکی ناوەنـد"ی نامـۆ، بـە هـۆی ئـەو ویسـتی خۆشەویسـتی و دەسـتهێنان بـە سـەر و پەسـەندکردنەوەوە بـوو کـە لەلایـەن منـەوە داخوازیـی لـێ دەکـرا. لەبـەر ئـەوە ئـەو هێـزەی مامۆسـتا گرنـگ بـوو بـەلای منـەوە کـە لەسـەر پۆلـە بیسـتوپێنج قوتابییەکـە هەیبـوو.

بەڵکو کەمێک ئەوم لەگەڵ دایکمدا لێکدەچواند، ویستێکی زۆر لە ناخمدا بوو بۆ ئەوەی دانپێدانانێک لەلایەن مامۆستاکەمەوە وەر بگرم. بۆ ئـەوەی لەلایـەن مامۆسـتاوە خۆشەویسـت بـم، جیـاواز و عاقـڵ ببینرێـم، نـەک بـە تەنهـا دەمویسـت وەڵامـی هەمـوو پرسـیارێک بدەمـەوە، بەڵکـو دەمویسـت ئەرکەکانیشـم بەباشـی بکـەم. مامۆسـتا دەیـوت، "بـەم شـێوەیە دەسـتەکانتان بخەنـە سـەر سنگتان، بەبێدەنگی دانیشـن." منیش دەسـتەکانم دەخسـتە سـەر سـنگم، بـە درێژاییـی وانەکـە بەسـەبرەوە دادەنیشتم. بەڵام لـە وانەکاندا کات تێنەدەپەڕی، لەبەر ئـەوەی چێژوەرگرتنـم لـە وەڵامدانـەوەی پرسـیارەکان، شـیکردنەوەی پرسـیارێکی ماتماتیکـی لەبـەردەم هەمـوو کەسـێکدا، یاخـود چێژوەرگرتـن لەبەدەسـتهێنانی نمرەیەکـی بـاش لـەلام کـەم بـووەوە، هەنێـک جـار کـات بـە شـێوەیەکی باوەڕپێنەکـراو بەهێواشـی دەڕۆیشـت.

چاوەکانم لەسـەر کەمئەقڵێک لادەبـرد کە لەسـەر تەختەکە دەیویست هەندێک شت بنووسـێت، لەسـەر قوتابییەکی قەڵـەو، مامۆسـتا، قوتابییـەک، خزمەتـکار، یاخـود چـاوم لەسـەر ئـەو کچـە لا دەبـرد کـە هەمووکات بـە سـەیرکردنێکی تەندروستەوە، بـە نییەتێکی بـاش و پێکەنیناوییـەوە، بـە هەمـان گەشـبینییەوە

سـەیری هەمـوو دنیـای دەکـرد، دواتـر لـە پەنجەرەکـەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، چاوم دەخستە سەر لقی سەرەوەی درەختی کەستانەیەک کە لەنێوان ئەپارتمانەکانەوە دیار بوو. قەلەڕەشێک لەسـەر لقەکـە دەنیشـتەوە. بەوریاییـەوە سـەیرم دەکـرد. لەنێـوان لقەکـە و قەلەڕەشـەکەدا کـە جەسـتەیم لـە خـوارەوە لـێ دیـار بـوو، پارچەهەورێـک هـەم شـێوەی و هـەم شـوێنی دەگـۆڕی. هەورەکـەم لـە پێشـدا بـە لووتـی ڕێوییـەک، یاخـود سـەری، دواتـر بـە سـەگێکم دەچوانـد. دەمویسـت ئیتـر سـەگەکە شـێوەی نەگۆڕێت، هەورەکە وەک سـەگێک بـەردەوام بێت لـە ڕێگەکـەی، بـەڵام دوای کەمێکی تـر هەورەکـە شـێوەی دەگـۆڕا، لـە یەکێـک لـەو شـەکردانە قاچدارە زیوییانـە دەچـوو کـە لەنـاو جامخانـەی دۆلابەکـەی نەنکمـدا بـوو، کـە هیـچ کاتێـک نەدەکرایـەوە، ئیتـر لـەو سـاتەدا مـن دەمویسـت لـە ماڵـەوە بـم. کاتێکت بێدەنگیی نـاو سـێبەرەکانی ماڵـەوە و بارە متمانەبەخشـەکەی دەهـات بـە مێشـکمدا، لەنـاکاو لەنـاو ئـەو سـێبەرانەوە باوکـم دەر دەکـەوت، هـەر وەک خەوێـک، ڕۆژی یەکشـەممە هەموومـان پێکـەوە بـە ئۆتومبێـل دەچوویـن بـۆ گەروو بۆ پیاسەکردن. لـەو کاتـەدا پەنجـەرەی ئەپارتمانەکـەی بەرامبـەر دەکرایـەوە، خزمەتکارێـک پـەڕۆی تۆزسـڕینەکەی دەسـتی دەتەکانـد، دواتـر ئەویـش وەک مـن داڵغـەی لێـدەدا و سـەیری کۆڵانەکـەی دەکـرد، کـە مـن نەمدەتوانـی ببینـم لـەو شـوێنەوەی کـە لێـی دانیشـتبووم. بڵێـی چـی لـە کۆڵانەکـەدا بێت؟ گوێـم لـە ڕۆشـتنی ئەسپوعەرەبانەیەک دەبوو کە بەسـەر بەردڕێژی کۆڵانەکەدا ڕێی دەکرد، گوێبیستی کەسێک دەبووم کە بـە دەنگـە کزبووەکـەی هـاواری دەکـرد، "کۆنەفرۆۆۆش".

خزمەتچییەکە دوای ئەوەی سەیری کۆنەفرۆشەکەشی دەکرد دەچووە ژورەوە، لە تەنیشت ئەو پەنجەرەیەوە کە ئەو دای دەخست، هەورێکی ترم دەبینی کە ڕێی دەکرد بەخێرایی پارچەهەورەکەی کە کەمێک پێشتر بینیبووم، بەلام بە پێچەوانەی ئاراستەی ئەوەوە دەڕۆی. کاتێک هەورەکە لە شووشەی پەنجەرەکەی تەنیشتەوە دەبینرا، کە بەردەوام بوو لە ڕێکردن، لە خۆمم دەپرسی، تۆ بڵێی ئەم پارچە هەورە کە شکانەوەکەی لە پەنجەرەکەوە دیارە ڕێوی- سەگ - شەکردانەکەی کەمێک پێش ئێستا بێت. ڕێک لەو کاتەدا لە پۆلدا جووڵەیەک ڕووی دەدا، کە پەنجەی قوتابییەکانم دەبینی بەرز بوونەتەوە، سەرەڕای ئەوەی گوێبیستی پرسیارەکەی مامۆستا نەبوبووم، بەشڵەژانەوە منیش پەنجەمم بەرز دەکردەوە، بە وەستانێکی متمانەبەخشەوە چاوەڕێم دەکرد وەک بڵێی وەلامە ڕاستەکە دەزانم. هەتا لەو یەکەم ساتانەی کە هێشتا نەمدەتوانی لە وەلامی قوتابییەکانی ترەوە لە پرسیاری مامۆستاکە تێبگەم، بڕوایەک دەهاتە ناو مێشکە خەیاڵبردووەکەمەوە، کە سەرچاوەیەکی بۆشی هەبوو، لە بارەی ئەوەی کە وەلامە ڕاستەکە زۆر بەباشی دەزانم.

بە درێژایی چەندەها ساڵ ئەو شتەی پۆلەکەی لەلام دەکرد بە شوێنێکی خۆش، کە دوو-دوو لەسەر کورسییەکانی دادەنیشتین تێیدا، بەدەر لەو شتانەی کە لە وانەکاندا فێری دەبووم، مامۆستا بە شێوەیەکی باش دانی پێدا دەنام، چێژی ناسینی یەکە بە یەکەی هاورێکانی پۆلەکەم بوو کە بە شێوەیەکی کەمێک سەرسام، کەمێک شەیدا، کەمێکیش بە ئازارەوە دەمبینی ئەوان چەندە جیاوازن لە من. بۆ نموونە

ئەو منداڵە بەدبەختە لە پۆلەکەماندا بوو کە لەوانەی تورکیدا کاتێک شتێکی دەخوێندەوە و ڕستەکە تەواو دەبوو، لەجیاتیی لە ڕستەی خوارترەوە بەردەوام بێت لە خوێندنەوەکەی، ڕستەیەکی دەپەڕاند و بەردەوام دەبوو، سەرەڕای هەموو وریاییەک بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی ئەو هەڵەیە ڕاست بکاتەوە کە هەموو پۆلەکەی خستۆتە پێکەنین. لە پۆلی یەکی سەرەتاییدا بۆ ماوەیەک کچێک لە تەنیشتمەوە دادەنیشت کە قژێکی سوور و درێژی هەبوو، کە وەک کلکی ئەسپ دەیبەست، ناو جانتاکەی پڕ بوو لە سێوی قەپلێگیراو، سمیت، کونجی، قەڵەم، لاستیکی قژ و زۆر تێکەڵوپێکەڵ و پیسوپۆخڵ بوو، بەڵام ئەو بۆنە خۆشەی لەوانتایە[1]، کە لە خۆی و جانتاکەیەوە دەهات منی پەیوەستی ئەو دەکرد، شەیدای ئەوە بووم کە هەموو شتێکی بەبەجەرگییەوە باس دەکرد، ئەگەر لە کۆتاییی هەفتەدا ئەوم نەبینیبایە بیرم دەکرد. سەری منداڵێک ڕێک لە قاپ دەچوو، وەک هەندێک جار کە نەنکم دەیوت، دڵناسکیی کچە بچوکەکە منی شەیدا دەکرد، سەرسام دەبووم بە سێیەمینیان کە بێ ئەوەی هیچ شتێک بشارێتەوە هەموو ڕووداوەکانی ناوماڵەوەی دەگێڕایەوە، خۆم بە خۆمم دەوت شتی وەها چۆن دەبێت. چۆن ئەو کچە کاتێک شیعری ئەتاتورک دەخوێنێتەوە بە ڕاستی دەگری، ئەوەیان چۆن دەتوانێت درۆ بکات، کە سوور دەزانێت هەموو کەس تێدەگات شتەکە درۆیە، سێیەمیان چۆن جانتا، دەفتەر، بەرکۆش، قژ، قسەکردن و هەمووشتێکی ئەوەندە ڕێکوپێکە؟

هەر وەک چۆن مێشکم بە شێوەیەکی خۆڕسک لووتی

---

[1] جۆرە گوڵێکە و لە هەمان کاتیشدا براندێکی عەترە.

ئەو ئوتومبێلە هەمەچەشنانەی کۆڵانەکانی بە شتێک دەچواند کە پێکهاتبوون لە گڵۆپ و دەعامی و بۆنیتی پێشەوە و جامەکانی، زۆربەی منداڵەکانی ناو پۆلەکەشم بە شتێک دەچواند: بۆ نموونە لووتتیژەکە بە ڕێوی، کەتە و زلەکە، هەر وەک هەمووکەس دەیوت: بە ورچ، قژبژەکە بە ژیشک... دێتەوە یادم کە کچێکی یەهوودی بە ناوی مارییەوە بەدرێژی باسی لە جەژنێک کردبوو کە هیچ کاری هەویریان نەکردبوو، هەتا هەندێک ڕۆژ نەنکی (دایکی باوکی) دەستکاریی پلاکی کارەباکەی ماڵەوەی نەکردووە. کچێکی تریش گێڕابوویەوە کە شەوێکیان لە ژوورەکەی خۆیدا بەخێرایی ئاوڕی داوەتەوە بۆ دواوە، سێبەری پەرییەکی بینیوە، ئەمە بە ترسەوە لە خەیاڵمدا مابووەوە. ئەو کچەی کە قاچەکانی زۆر درێژ بوون و گۆرەویی درێژی لە پێ دەکرد، هەمووکات بە شێوەیەک دەبینرا وەک بلێی دەگری، باوکە وەزیرەکەی لە کارەساتی ئەو فڕۆکەیەدا مردبوو کە عەدنان مەندەرەسی سەرۆکوەزیران بە شێوەیەکی ئاسایی لێوەی دابەزیبوو، من وام دەزانی کە کچەکە پێش ئەوەی باوکیشی بمرێت درکی بە ڕوودانی کارەساتەکە کردووە و دەگری. وەک من زۆربەی منداڵەکان لەگەڵ ددانەکانیاندا کێشەیەکیان هەبوو، هەندێکیان ددانەکانیان تەلی لێ بەسترابوو. باس دەکرا کە دکتۆرێکی ددان لە تەنیشتی ژووری تیمارگەکەدایە، لە یەکێک لە نهۆمەکانی سەرەوەی بیناکەی تەنیشتدایە کە خەوتنگەی ئامادەیی و هۆڵی یاریگەشی لێ بوو، کاتێک مامۆستا تووڕە دەبوو هەڕەشەی لە سەرکێشیکەرەکان دەکرد بە ناردنیان بۆ ئەوێ. سزایەکی بچوکتر ئەوە بوو کە لە سووچی

نێوان دەرگاکە و ئەو دیوارەی کە تەختەڕەشەکەی پێدا هەڵواسرابوو پشت بکەیتە پۆلەکە، بە پێوە بوەستیت. ئەم سزایە هەندێک جار دەبوو بەوەی کە لەسەر "یەک قاچ" بوەستیت، بەڵام ئەم سزایەیان بەکار نەدەهێنا، لەبەر ئەوەی ئیتر پۆلەکە گوێیان لە وانەکە نەدەگرت، بەڵکو سەیری ئەوەیان دەکرد کە قوتابییە سزادراوەکە تا چەند دەتوانێت لەسەر یەک قاچ بوەستێت. ئەو چەتانەی کە دەنێردران بۆ سووچەکە، ئەگەر لەسەر یەک قاچیش نەوەستانایە، تفیان دەکردە ناو تەنەکەی خۆڵەکەوە، بێ ئەوەی بهێڵن مامۆستا هەستی پێ بکات و ڕوەو پۆلەکەدا جووڵەیان بە چاو و برۆیان دەکرد، هەندێک شتی وەهایان دەکرد کە ئیرەیی و توڕەیی لە ناخمدا دروست دەکرد، نەک شەیدابوون.

سەرەڕای ئەو پاڵپشتی و کۆمەڵبوونەی قوتابییەکان، کە لە دواتردا لە ناخەوە باوەڕم پێ دەهێنا، هەندێک جار سەرزەنشتکردن، سزادان، ئەزییەتدان، لێدانی تەمبەڵەکان، چەتەکان، گەمژەکان، بێشەرمەکان لەلایەن مامۆستاوە، منی دڵخۆش دەکرد. بۆ نموونە کچێکی گرگن هەبوو کە لەگەڵ هەموو کەسدا بە (من و تۆ) قسەی دەکرد، شۆفێرەکەی بە ئوتومبێل دەیهێنا بۆ قوتابخانە، مامۆستا داوای هەرچییەکی لەو بکردایە زۆر بەئاسودەییەوە هەڵدەسایە سەر تەختەکە، بەپێکەنینەوە دەستی دەکرد بە وتنی گۆرانییەکی ئینگلیزی "*جینگیل بێلس، جینگیل بێلس، جینگیل ئال زە بێلس.*" سەرەڕای ئەوەی بەینی لەگەڵ مامۆستادا ئەوەندە باش بوو، لەبەر ئەوەی ئەرکەکانی بەباشی نەدەکرد، بێزار نەدەبووم لەوەی شایەتی نزمکردنەوەی و ئەزییەتدانی بم لەلایەن

مامۆستاوە. هەموو جارێک لە کاتی پشکنینی ئەرکەکاندا لەلایەن مامۆستاوە، چەند کەسێک سەرەڕای ئەوەی ئەرکەکانیان بەجێ نەدەهێنا، بە شێوەیەک هەڵسوکەوتیان دەکرد وەک بڵێی ئەرکەکانیان بەجێ هێنابێت، بەڵام ئێستا لەنێوان پەڕەی دەفتەرەکەیاندا بۆیان نادۆزرێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە مامۆستا بەمە هەڵنەدەخەڵەتا هیچ تێنەدەگەیشتم بۆچی ئەم ڕێگەیەیان دەگرتە بەر، کاتێکیش بیانوویەکیان دەدۆزییەوە، بە شڵەژان و ترسنۆکییەوە دەیانوت، "مامۆستا ئێستا بۆم نادۆزرێتەوە." بەتەنها کەمێک سزاکەیانی دوا دەخست، بەڵام هێزی شەقازلە و گوێچکەڕاکێشانەکەی زیاتر دەکرد. ئەو لێدانانەی کە لە قوتابخانەکانی عوسمانیدا هەبووە، ئەو دارە درێژەی کە مامۆستا لە شوێنی خۆیەوە داوێتی بەسەری قوتابیدا، ئەو فەلاقەیەی یادگارییەکانی قوتابخانە و منداڵی و کتێبەکەی ئەحمەد ڕاسیم، کە بە ناوی *شەوە فەلاقاوییەکانمەوەیە*(١٨٦٥- ١٩٣٢)، لە ساڵەکانی دواتردا لە کتێبی قوتابخانەدا، وەک پاشماوەیەکی خراپەکارییەکانی پێش کۆماریەت و ئەتاتورک بۆ ئێمە باس دەکرا. بەڵام هەتا لە ئامادەیی ئیشیکە دەوڵەمەندە تایبەتە بە پارەکەی نیشانتاشیدا، هەندێک لەو نوێکارییانەی کە پێی دەوترێت هاوچەرخبوون، جێبەجێکردنی ئەو هەڵمەتانەی بەسەر بێهێزەکاندا دەدرا و پێی دەوترا نوێکردنەوە؛ ئیتر لە جێگەی فەلاقە یاخود دار، ڕاستەیەکی فەرەنسی بەکار دەهێنرا کە کەنارەکانی پارچەیەک مایکای ڕەقی لێ درابوو، وا بزانم ئەو مامۆستا پیر و کەللەڕەقانەی لە سەردەمی عوسمانییەوە مابوونەوە پەییان بەمە دەبرد.

کاتێک مامۆستا قوتابییەکی دەستنیشان دەکرد کە بەعینادییەوە ئەرکەکانی بەجێ نەهێناوە و بە هاروهاجییەکەی مامۆستای بێزار کردووە، دواتر دەیهێنایە بەردەمی هەموومان، ساتی ئەو لێدانە بەئازار و نزمکەرەوەیە دەستی پێ دەکرد، دڵم دەکەوتە پەلەپەل، مێشکم تێکەڵ دەبوو. تاکو تەمەنمان بەرەو گەورەبوون بچوایە، بکەوتینایەتە بەردەستی مامۆستای وەک ژنە شیرین و دایکئاساکان، مامۆستای جومناستیک، مامۆستای دین، مامۆستای موزیک و بەردەستی مامۆستا پیر و توورە و لەژیانبێزاربووەکان، لە پێشدا لە ناوەڕاستی وانە بێزارکەرەکەدا چەند خولەکێک بۆ چێژی تەماشاکردن، بەئاسودەییەوە پەسەندی ئەم ڕێوڕەسمی سزادانەم دەکرد کە بەرەو زۆربوون دەچوو. ئەگەر قوتابی سەیری بەردەمی خۆی بکات، وەک پشیلەیەک کە شیرت خستبێتە بەردەمی، دان بە تاوانەکەیدا بنێت، چەند پاساوێکی لێبوردنی باوەڕپێکراو ڕیز بکات، ئەوکات سزاکەی سووک دەبوو. بەڵام ئەوانەی کە پاساوی لێبوردنەکانیان لە تاوانەکانیان گەورەتر بوو، ئەوانەی کە نەیاندەتوانی ئەگەر بە درۆش بێت بیانوویەک بدۆزنەوە بۆ ئەوەی تاوانەکەیان بچووک بکەنەوە، ئەوانەی کە تاقەتیان نەبوو درۆیەکیش ڕێک بخەن و لێدانەکەیان هەڵدەبژارد و کاتێک مامۆستا نزمی دەکردنەوە، ئەزیێتی دەدان، جارجارێک جووڵەیان بە چاو و برۆیان دەکرد و پۆلەکەیان دەخستە پێکەنین، لە لایەکەوە درۆی ناشیانەیان دەگونجاند، لە لایەکی تریشەوە لە ناخەوە سوێندیان دەخوارد دەیانوت، "مامۆستا جارێکی تر درۆ ناکەم." کاتێک بە هۆی نزمکردنەوەوە لەناو ئاو

و عارەقدا نوقم دەبوون و هەندێکیان بێ ئەوەی بزانن هەڵەیەکی تریشیان دەکرد کە بە هۆیەوە سزاکەیان زیادی دەکرد، وەک ئاژەڵێک کە کەوتۆتە ناو داوێکەوە، ئەمانە لە هەموو کتێبەکانی زانیاری ژیان، گۆڤارەکانی زانیاری پۆل، زیاتر شتی قووڵیان فێری من دەکرد لەبارەی مرۆڤایەتی و ژیانەوە.

هەندێک جار کچێکی ڕێکوپێک، جوان یاخود لە دورەوە خۆشەویستیم هەبوو بە دڵناسکییەکەی، کاتێک دەمبینی لە ساتی ئەم نزمکردنەوە و داوای لێبوردنکردنەدا سیمای سوور بووەتەوە، فرمێسک لە چاوەکانیدا کۆ بۆتەوە، دەمویست ڕزگاری ببێت. کاتێک ئەو منداڵە قژزەردە قەڵەوەی لە پشووەکاندا ئەزیەتی منیشی دەدا، دەمبینی تاکو قسەی بکرادایە نوقومتر دەبوو لە تاواندا، تاکو نوقمتر بووایە شەقازلەی زیاتری دەخوارد، بە دڵڕەقی و چێژوەرگرتنەوە سەیری حاڵیم دەکرد. نەمدەتوانی تێبگەم لە هۆکاری بەرهەڵستیکردنی منداڵێکی بێدەنگ، نەفسبەرز، سیس و لاواز کە من بە گەمژە و بێهەستم دەزانی، کاتێک مامۆستاکەی زۆر تووڕە دەکرد، دواتر فرمێسک لە چاوانی منداڵەکەوە دەهاتە خوارێ، هیلاک دەبووم لەوەی کە لە هەمان ساتتدا حەقم دەدا هەم بە مامۆستاکە هەم بە قوتابییەکە. هەندێک لە مامۆستاکان چەند دڵخۆش دەبوون بەوەی ئەو قوتابییەی کە هەڵیان ساندووەتە سەر تەختە لەجیاتیی ئەوەی زانیارییەکەی پیشان بدات، نەفامی، نەزانینەکەی پیشان بدات و نزمیبکەنەوە، هەندێک قوتابییش لەجیاتیی ئیدامە بە دۆخەکەی بدەن و ڕزگاریان ببێت، بە شێوەیەک هەڵسوکەوتیان دەکرد کە

زۆر ئـارەزوو لـە نزمکردنـەوە دەکـەن. هەندێـک مامۆسـتا هـار دەبـوون کاتێـک دەفتەرێکیـان دەبینـی ڕەنگـی بەرگـە تێگیراوەکـەی هەڵەیـە، هەندێکیـان بـە شـەقازلەیەک سـەرکوتی چرپەچرپێکی پچووکیان دەکرد، کە لـە کاتی تردا هیچ گوێیان نەداوەتـێ، هەندێـک قوتابـی بەرامبـەر پرسـیارێکی ئاسـان کـە وەڵامەکەشـیان دەزانـی، وشـک دەبـوون وەک کەروێشـکێک کـە بەشـەوارە کەوتبێت لـە کاتـی بینینی گڵۆپـی ئوتومبێلێکدا، هەندێکیشـیان کـە مـن بـەزۆری ڕێـزم لەوانـە دەگـرت، ئەگـەر وەڵامەکەشیان نەزانیایە بە نیەتێکی باشـەوە باسـی شتێک لـەو شـتانەیان دەکـرد کـە دەیانزانـی.

لەم ساتە ترسناکانەدا کە هەندێک جار بە سەرزەنشتکردن و فرێدانـی دەفتـەر و کتێب دەسـتی پێ دەکرد، هیچ ورتەیـەک لـە قوتابییانـی پۆلەکـەوە نەدەهـات، مـن شـوکرم دەکـرد لەبـەر ئـەوەی لـەو قوتابییـە شانسـدارانە بـووم کـە دۆخـی نزمکردنەوەیەکـی وەهـام بەسـەردا نەهاتـووە. لـە سـێ بەشـدا بەشێکی پۆلەکە لەم شانسدارانە بوون. بە پێچەوانـەی هەندێک قوتابخانـەی حکومییـەوە کە دەوڵەمەنـد و هـەژار پێکـەوە تیایدا دەیانخوێند، لـەم قوتابخانـە تایبەتـەدا ئـەو هێڵـە نهێنییـەی کـە نزمکراوەکانـی جیـا دەکـردەوە لـەو شانسـدارانەی کـە ئەزیـەت نـەدەدران، هیـچ پەیوەندییەکـی بـە دەوڵەمەنـدی یاخـود هەژارییـەوە نەبـوو. دوای ئـەوەی ڕاهاتـم لەگـەڵ قوتابخانـەدا، لە پشـووەکاندا بە برایەتییەکی منداڵئاسـاوە ڕامـان دەکرد، ئـەم هێڵـە نهێنییـەی کـە بەدڵخۆشـییەوە بیرم دەچـووەوە و ڕۆحیشـم بەرپەرچـی دەدایـەوە، لـە کاتێک مامۆسـتا لەسـەر کورسـییەکەی وەک پەیکەرێکـی مۆنۆمێنتـی دەسـەڵات دادەنیشـت، لەنـاکاو

دەهاتە مەیدانەوە. لە کاتی ئەم لێدان و نزمکردنەوانەدا خۆم لە خۆم دەپرسی، هەندێک بۆچی زۆرتر تەمبەڵ، نەفسنزم، بێئیرادە، بێهەست، بێعەقڵن یاخود بۆچی "بەو شێوەیەن". بەڵام نە ئەو ڕۆمانە وێنەدارانەی لەو کاتانەدا دەستم کردبوو بە خوێندنەوەیان، کە دەمی هەموو مرۆڤە خراپەکانی بە خواری و ناشرینی تێدا کێشرابوو، نە هەستە منداڵئاساکەم، نەیاندەتوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەنەوە کە وەک دەرگایەک دەکرایەوە بە ڕووی تاریکایی ژیان و ڕۆحی هاوڕێکانی پۆلەکەمدا. لە هەموو ئەو شتانەوە بۆم ڕوون دەبووەوە ئەو شوێنەی کە پێی دەوترێت قوتابخانە، لە ڕاستیدا ناتوانێت وەڵامی پرسیارە بنچینەییەکان بداتەوە، بە تەنها یارمەتیمان دەدات کە وەک ڕاستییەکی ژیان قبووڵی بکەین. لەبەر ئەوە تاکو ساڵەکانی ئامادەیی بەوریاییەوە پەنجەم هەڵدەبڕی و خۆمم هەڵدەدایە لایەنە ئاسوودەکەی هێڵە نهێنییەکەوە.

بەڵام ئەو شتە ڕاستییەی کە لە قوتابخانە فێری بووم قبووڵکردنی ئەو "ڕاستییانەی" ژیان نەبوو کە پرسیاری لەبارەوە ناکرێت، هەستم دەکرد کە ئەفسوناوییبوونە بەوان. لە یەکەم ساڵەکاندا مامۆستا لەبەر هەر بیانوویەک بێت زوو زوو لە ناوەڕستی وانەدا گۆرانیی پێ دەوتین. کاتێک بە شێوەیەک دەمم دەجووڵاند وەک بڵێی گۆرانییەکە دەڵێمەوە کە لە وشە ئینگلیزییەکان و فەرەنسییەکانی تێنەدەگەیشتم و ئارەزووشم لێ نەبوو، دڵخۆش دەبوم بە سەیرکردنی هاوڕێکانی پۆلەکەم. (گۆرانیی تورکیی وەرگێڕاوی وەک: باوکی پاسەوان، باوکی پاسەوان، جەژن هات فیکە لێبدە- یان دەوت.) منداڵە خڕیلانە باڵاکورتەکەی کە نیو کاتژمێر

پێش ئێستا دەگریا لەبەر ئەوەی دووبارە دەفتەرەکەی لە ماڵەوە بیر چووبوو، ئێستا بەدڵخۆشییەوە تا لە توانایدا بوو دەمی دەکردەوە و گۆرانیی دەوت. ئەو کچەی کە زووزوو قژە درێژەکەی دەخستە پشتی گوێچکەکانیەوە، لە ناوەڕاستی گۆرانییەکەدا دووبارە هەمان جووڵەی دەکردەوە. یەکێک لە چەتە قەڵەوەکان کە لە پشووەکاندا بەردەوام لە ڕاڕەوەکاندا منی ڕاو دەنا، لەگەڵ یەکێکی تریان کە لەو فێڵبازتر و زیرەکتر بوو، سەرەڕای ئەوەی کە ئەوەندە نزم بوون، ئەمەندەی دەزانی کە بیتوانیایە لە لایەنی من، لایەنە ئاسوودەکەی هێڵە نهێنییەکە بمێنێتەوە، ئێستا بە دەربڕینێکی پەرییانەوە لەناو هەوری موزیکەکەدا ون بوون و ڕۆیشتوون. کچە ڕێکوپێکەکە لە ناوەڕاستی گۆرانییەکەدا جارێکی تر پشکنینی قوتووی قەڵەمەکانی و شوێنی دەفتەرەکانی دەکرد. ئەو کچە سەعیکەرە زیرەکەی هەموو جارێک لێی دەپرسیم، "پێکەوە بین؟" بەبێدەنگی دەستی دەگرتم بۆ ئەوەی دوو-دوو بە ڕیز لە باخی قوتابخانەوە بچین بۆ ناو پۆلەکەمان، بۆ ئەوەی گۆرانییەکە باشتر بڵێت زۆر بەسەرنج و بەئاگا بوو. کوڕە ڕەزیل و قەڵەوەکەی کە لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا وەک بڵێی دایک بێت و شیر بدات بە منداڵەکەی، خۆی دەدا بەسەر کاغەزەکەیدا بۆ ئەوەی کەس سەیری نەکات، لە کاتی گۆرانیوتندا بە شێوەیەک جەستەی خۆی دەکردەوە کە هیچکات بۆ کەسی نەدەکردەوە. یەکێک لەو گەمژانەی کە هەموو ڕۆژێک لێدانی دەخوارد، بەویستەوە بەژداریی گۆرانییەکەی دەکرد. کاتێک دەمانبینی قوتابییەکی بەراز قژی کچەکەی بەردەمی ڕادەکێشێت، کچەکەش جارجارێک دەگری

و لـە کاتـی گۆرانیوتنـدا لـە پەنجەرەکـەوە سـەیری دەرەوە دەکات، ئێمـەش لەگـەڵ کچـە قژسـوورەکەدا، کـە وەک کلکـی ئەسپ دەیبەستن، بۆ ساتێک چاومان دەخستە سەر چاوی یەکتر، پێدەکەنین. کاتێک دەگەیشتینە سەر بڕگەی لای لا لای لا لای لای لای گۆرانییەکە، کە هیچ تێی نەدەگەیشتم، منیش بە هاوشێوەی بەرزیی دەنگی هەموویان بەکەیفخۆشییەوە بەشداریی گۆرانییەکەم دەکرد، دواتر کاتێک لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەم دەکرد، بیرم دەکردەوە کە پاش کەمێکی تر، پاش کەمێکی تر، زەنگ لێدەدات، هەموو پۆلەکە لە یەک ساتدا بەگرمەگرمەوە باوەش دەکەن بە پاڵتۆ و جانتاکانیاندا، کاتێک جانتاکەم بە دەستێکم هەڵگرتووە، دەستێکیشم بە دەستە زلەکەی دەرگاوانەکەوەیە کە من و کاکم دەباتەوە بۆ ماڵەوە، کە سێ خولەک دوورە لە قوتابخانەکەمانەوە، ئەوکات هیلاک بووم لە هەموو ئەم دۆخە مرۆڤییانەی ناو پۆلەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی کەمێکی تر دایکم دەبینم هەنگاوەکانم خێرا دەکەم.

# ناچم بۆ قوتابخانە

**[لە کتێبی *ڕەنگەکانی ترەوە*. لە زاری ڕوویای کچی نووسەرەوە نووسراوە.]**

ناچم بۆ قوتابخانە، چونکە زۆر خەوم دێت، سەرمامە. لە قوتابخانە کەس منی خۆش ناوێت.

ناچم بۆ قوتابخانە، چونکە دوو منداڵ لەوێن لە من گەورەترن، لە من بەهێزترن. کاتێک بەلایاندا دەڕۆم، دەستەکانیان دەکەنەوە و بەم شێوەیە ڕێگەم لێ دەگرن. دەترسم.

دەترسم، ناچم بۆ قوتابخانە. لە قوتابخانە کات بە هیچ شێوەیەک ناڕوات. هەموو شتێک لە دەرەوە دەمێنێتەوە، لە دەرەوەی دەرگای قوتابخانە.

بۆ نموونە: ژوورەکەی ماڵەوەم و دواتر دایکم، باوکم، شمەکی یاریکردنەکانم، باڵندەکانی باڵەکۆنەکە. کاتێک لە قوتابخانە بیر لەوانە دەکەمەوە، دەمەوێت بگریم. لە

پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکەم. لە دەرەوە هەور بە ئاسمانەوەیە.

ناچم بۆ قوتابخانە. چونکە لەوێ هیچ شتێکم خۆش ناوێت.

ڕۆژی پێشوو وێنەی درەختێکم کێشا. مامۆستا وتی، "ئافەرین، زۆر درەختت دروست کردووە." دانەیەکی تریشم دروست کرد، ئەمەیان گەڵای پێوە نەبوو.

دواتر یەکێک لەوان هات، گاڵتەی پێ کردم.

ناچم بۆ قوتابخانە. کاتێک شەو دەخەوم بیر دەکەمەوە کە بەیانی دەچمە قوتابخانە، بێتاقەت دەبم. دەڵێم، "ناچم بۆ قوتابخانە." دەڵێم، "چۆن شتی وا دەبێت! هەموو کەس دەچێت بۆ قوتابخانە."

هەموو کەس؟ ئەوکات با هەموو کەس بچێت، چی دەبێت ئەگەر من لە ماڵەوە بمێنمەوە؟ دوێنێ چووبووم، بەیانی ناچم، ڕۆژی دواتر دەچم.

ئەگەر لە ماڵەوە لە جێگەکەمدا بوومایە. یاخود لە ژوورەکەمدا. خۆم بەتەنها. لەم قوتابخانەیە نەبوومایە، ئیتر لەکوێ بوومایە با لەوێ بوومایە.

ناچم بۆ قوتابخانە، نەخۆشم. دەیبینن، کە دەڵێن "قوتابخانە" گەدەم تێک هەڵدێت، سکم دەهێشێت، هەتا ناتوانم ئەو شیرەش بخۆمەوە.

شیر ناخۆمەوە، هیچ شتێک ناخۆم، ناشچم بۆ قوتابخانە. زۆر خەمبار دەبم، هیچکەس منی خۆش ناوێت. ئەو دوو منداڵە لە قوتابخانەن. دەستەکانیان دەکەنەوە و ڕێگەم پێ دەگرن.

چووم بۆ لای مامۆستا. مامۆستا وتی، "بۆچی بەدوامدا دێیت؟" شتێکت پێ بڵێم، بەڵام نابێت تووڕە ببیت. من هەر بەدوای مامۆستادا دەڕۆم، مامۆستاش دەڵێت، "بەدوامدا مەیە."

ئیتر ناچم بۆ قوتابخانە. بۆچی؟ لەبەر ئەوەی نامەوێت بچم بۆ قوتابخانە، بۆیە.

کاتێک پشوو دەبێت نامەوێت بچمە باخەکەشەوە. لەو کاتەدا کە هەموو کەس منی بیر چووەتەوە پشوو دەست پێ دەکات. ئەوکات هەموو شتێک تێکەڵاوی یەک دەبێت، هەموو کەس ڕادەکات.

مامۆستا بەخراپی سەیری من دەکات، بەجوانییش نا. نامەوێت بچم بۆ قوتابخانە. ئەو منداڵە هەیە کە منی خۆش دەوێت، بەتەنها ئەو بەجوانی سەیرم دەکات. بە کەس مەڵێ، بەڵام من ئەو منداڵەم خۆش ناوێت.

لەو شوێنەی کە لێی دانیشتووم، هەر وا دەوەستم. هەست دەکەم کە زۆر تەنهام. فرمێسک لە چاوەکانمەوە دێتە خوارێ. قوتابخانەم هیچ خۆش ناوێت.

دەڵێم، نامەوێت بچم بۆ قوتابخانە. دواتر ڕۆژ دەبێتەوە، بەیانی دێت، من دەبەن بۆ قوتابخانە. ناتوانم هیچ پێبکەنم، سەیری بەردەمی خۆم دەکەم، دەمەوێت بگریم. وەک سەرباز جانتایەکی گەورە بە پشتمەوە، لە هەورازەکە دەچمە سەرەوە، چاوم لەسەر قاچە بچووکەکانمە کە بە هەورازەکەدا سەر دەکەوێت. هەموو شتێک زۆر قورسە، تووڕەکەکەی پشتم، شیرە گەرمەکەی ناو گەدەم. دەمەوێت بگریم.

دەچمە قوتابخانە. دەرگای باخەکە، ئاسنە ڕەشەکە دەداخرێت. دایکە سەیرم بکە من لە ژوورەوەم، دەگریم.

دواتر دەچمە پۆلەوە و دادەنیشم. دەمەوێت هەورەکەی دەرەوە بم.

قەڵەم، دەفتەر، لاستیک؛ هەموویان لەناو بچن.

# ساڵەکانی قوتابخانەی ناوەندیی مەولود

**[لە ڕۆمانە نوێکەی نووسەرەوە بە ناوی *سەمەرەیەک لە سەرمدا*. ئەو بەشەی کە تێیدا باس لە ساڵانی قوتابخانەی ناوەندیی مەولود کارەتاشی قارەمانی ڕۆمانەکە دەکات.]**

ئامادەییی ئەتاتورکی کوڕان لە دوتتەپە، لەسەر تەختاییەکی نزمی سەرەتای ئەو ڕێگەیەدا دروست کرابوو کە دوتتەپە و گردەکانی پشتەوەی دەبەستەوە بە ئیستانبوڵەوە. لەو گەڕەکانەوە کە ڕیز کرابوون بە درێژاییی بۆقلودەرە - جۆگەی گوواوی - لەو گردانەوە کە بەخێرایی بە خانووی بێتاپۆ دادەپۆشران، کاتێک ژنەکان لە باخەکانیاندا جلیان هەڵدەخست، بە تیرۆک هەویریان پان دەکردەوە، کوڕە بێئیشەکان لە چایخانەکاندا یاریی ئۆکەی و کاغەزیان دەکرد، دەیانتوانی بینا پرتەقاڵییەکەی قوتابخانەکە و پەیکەرەکەی ئەتاتورک ببینن، هەم ئەو خوێندکارانەشیان دەبینی کە لە دوورەوە وەک خاڵێکی بچووکی ڕەنگاوڕەنگ دیار بوون،

کە بەردەوام لە باخە گەورەکەدا جومناستیکیان دەکرد (بە پێڵاوە لاستیکەکانی پێیانەوە، بە پانتۆڵ و کراسەکەی بەریانەوە) لەژێر چاودێریی مامۆستا کەریمە کوێردا، کە لە یەک کاتدا هەم مامۆستای دین، هەم جومناستیکیش بوو. هەموو چلوپێنج خولەک جارێک، جەرەسێک لێی دەدا، کە لە گردە دوورەکانەوە نەدەبیسترا، بە سەدەها قوتابی دەرژانە باخەکەوە و بڵاو دەبوونەوە، دواتر جەرەسێکی تر لێی دەدا، کە ئەویش نەدەبیسترا، هەموویان لە ساتێکدا ون دەبوون، بەڵام هەموو بەیانییەکی دووشەممان لە چواردەوری پەیکەرەکەی ئەتاتورکدا، کاتێک هەزار و هەشت سەد قوتابی هەموویان پێکەوە مارشی ئیستیقلالیان دەوت، بە شێوەیەکی بەهێز دەنگی دەدایەوە لەبەینی گردەکاندا و لە دەیەها هەزار ماڵی دەوروبەرەوە دەبیسترا.

پێش ئەوەی خوێندکارەکان مارشی ئیستیقلال بڵێن، فازیل بەگی بەڕێوبەر دەچووە سەر پلیکانەکانی ئامادەییەکە، کە لە بەردەمی بیناکەدا بوو، وتارێکی لەبارەی ئەتاتورکەوە دەخوێندەوە، کە باسی لە خۆشەویستیی نیشتیمان، گەل، سەرکەوتنە سەربازییە کۆنەکان - ئەو جەنگە خوێناوی و ڕزگاریخوازانە دەکرد، کە وەک جەنگی مۆهاچ[1] بوون و بیر ناچنەوە، داوای لە خوێندکارەکانی دەکرد کە وەکو ئەتاتورک بن. لەبەر ئەوەی خوێندکارە پیر و تێکدەرەکان لە قەرەباڵغییەکەدا قسەی گاڵتەجاڕی، هەندێک جار بێتەربێتییەکی سەیر، هەتا دەنگێکی ناخۆشیان دەر دەکرد کە مەولود لە سەرەتادا لەم دۆخە تێنەدەگەیشت، یاریدەدەری

١ مۆهاچ: شارۆچکەیەکە لە ناوچەی بارانیا لە باشووری هەنگاریا.

بەڕێوبەر، ئیسکەپەیکەر[1]، وەک پۆلیسێک بەوریاییەوە یەک-یەک چاودێریی خوێندکارەکانی دەکرد. بە هۆی ئەم چاودێرییە چڕەوە، مەولود دوای ساڵ و نیوێک و لە تەمەنی چواردە ساڵیدا، لەو ڕۆژانەی کە گومانی لە پێکهاتەی سیستمی خوێندنگەکەی دەکرد، ئەو خوێندکارەی دەناسی کە هەمووکات مەولود ڕێزی لێ دەگرت و حەیرانی بوو، ڕۆحێکی بەرەنگارانەی هەبوو، لە کۆبوونەوە قەرەباڵغەکاندا هەرکاتێک بیویستایە جرتی لێدەدا، هەم بۆ ڕاستڕەو و دیندارەکان، هەم بۆ چەپڕەو و نەتەوەپەرستەکان (خوێندکارە ڕاستڕەوەکان هەموویان دیندار، چەپڕەوەکانیش هەموویان نەتەوەپەرست بوون).

ئەو شتەی کە بەزۆری دڵی بەڕێوبەری دەشکاند لەبارەی داهاتووی خوێندنگاکە و تورکیاوە، ئەوە بوو کاتێک هەزار و هەشت سەد خوێندکار مارشی ئیستیقلالیان دەخوێندەوە و نەیاندەتوانی پێکەوە بیڵێن. کاتێک هەریەک لە شوێنی خۆیەوە بەگوێرەی ئارەزووی خۆی مارشی ئیستیقلالی دەخوێندەوە، هەتا هەندێک خوێندکاری "دەمارگیری خراپ" کە هیچ مارشەکەیان نەدەوتەوە، دەبووە هۆکاری تووڕەبوونێکی زۆری بەڕێوبەر. هەندێک جار خوێندکارەکانی سووچێکی باخەکەی ناو قوتابخانەکە مارشەکەیان تەواو دەکرد، بەڵام خوێندکارەکانی سووچەکەی تری باخەکە هێشتا نەگەیشتبوونە نیوەی مارشەکە، کاتێک بەڕێوبەر دەیویست هەموویان بە یەک دڵ و گیان مارشەکە پێکەوە بڵێن، بێ ئەوەی گوێ

[1] ئیسکەپەیکەر: یاریدەدەری بەڕێوبەر بوو، بەڵام خوێندکارەکان ئەم ناوەیان لێ نابوو.

بداتـە بـاران و بەفـر و سـەرما، سـەرلەنوێ مارشـەکەی بـە هـەزار و هەشـت سـەد خوێندکار دووبـارە دەکردەوە، هەندێک لـە خوێندکارەکانیـش بـە عینـادی و ناڕەسـەنی ئاوازەکەیـان تێک دەدا، دەبووە هـۆکاری پێکەنینـی خوێنـدکارەکان، ئەمـەش ڕێگـەی دەکـردەوە بـۆ دەنگەدەنـگ و شـەڕکردن لەنێـوان ئـەو خوێنـدکارە نیشـتیمانپەروەرانەی کـە سـەرمایان بـوو، لەگـەڵ ئەوانـەی گاڵتەجاڕییـان دەکـرد و خوێندنـەوەی مارشـەکەیان تێـک دەدا.

مەولـود لەبـەر ئـەوەی لـە یەکـەم ساڵەکاندا بـە هیـچ جۆرێک نەیدەویسـت دەسـت وەرداتـە کاری سیاسـییەوە، دووراودوور سـەیری ئـەم شـەڕانەی دەکـرد، کاتێـک بـە گاڵتەوگەپـی خوێندکارە ئاژاوەچییەکان پێدەکەنی، نـاوەوەی ڕوومەتـی خـۆی دەگەسـت بـۆ ئـەوەی ئێسـکەپەیکەر (یاریـدەدەری بەڕێوبـەر) نەیبینێـت کـە پێدەکەنێـت، بـەڵام پـاش کەمێکـی تـر کـە ئـاڵا مانـگ و ئەسـتێرەیییەکە هێـدی هێـدی بـەرز دەبـووەوە، بـە هەسـتی تاوانبارییـەوە چـاوی پـڕ دەبـوو لـە ئـاو، لـە ناخـەوە دەسـتی دەکـرد بـە وتنـی مارشـەکە. مەولـود سـەرەڕای ئـەوەی تاکـو تەمەنـی بەرەوپێـش بچووایـە مەیلـی واتـا نهێنییـەکان و ئاژاوەچێتـی لـە ڕۆحیـدا گەشـەی دەکـرد، بـەڵام تـا کۆتاییـی ژیانـی لـە هـەر شـوێنێک – هەتـا لەنـاو فیلمەکانیشـدا – ئەگـەر ئاڵایەکـی تورکیـای ببینیایـە کـە بـەرز دەبێتـەوە، دووبـارە بـە بینینـی ئـەو دیمەنـە چـاوی ئـاوی دەکـردەوە.

مەولـود زۆر ئـارەزووی بـوو وەک ئەتاتـورک بێـت، کـە هەمـوو شـتێکی لەپێنـاوی نیشـتمانەکەیدا بـوو، هـەر وەک چـۆن بەڕێوبەرکـەی لـە ڕێوڕەسـمی ئاڵاهەڵکردنـی ڕۆژی

دووشەممماندا دەیویست. هەر بۆیە دەبووایە سێ ساڵی ناوەندی و سێ ساڵی ئامادەیی تەواو بکردایە. لەبەر ئەوەی تا ئێستا هیچ کەسێک نە لە خێزانەکەی و نە لە لادێکەیاندا ئەمەی بەدەست نەهێنابوو، ئەم ئامانجە، ئالا، نیشتیمان، ئەتاتورک کە خەیاڵکردنیان خۆش بوو، هەر لە سەرەتای خوێندنی قوتابخانەی سەرەتاییەوە وەک شتێکی پیرۆز کە بەدەستهێنانی قورسە لە مێشکی مەولوددا مانەوە. زۆربەی ئەو خوێندکارانەی کە لە گەڕەکی خانووە بێتاپۆکانی وەک دوتتەپە و کوشتەپەوە دەهاتن بۆ قوتابخانە، یان لەگەڵ باوکیاندا کاریان دەکرد، کە لە کۆڵانەکاندا فرۆشیاریی دەکرد، یاخود وەک شاگردێک لای دوکاندارێک کاریان دەکرد. مەولود دەیزانی ئەمانە کە کەمێک گەورە بوون دەستبەرداری قوتابخانەکەیان دەبن. زۆربەیان سەرەیان دەگرت بۆ ئەوەی وەک شاگردێک بچنە لای خاوەنی سەموونخانەیەک یان چاککەرەوەیەکی ئوتومبێل یان لەحیمچییەک. زۆربەی ئەوانەی کە باوکیان لە بنیاتنانەکاندا کرێکارییان دەکرد، ئیشیان لە شوێنی ئیشە بێکەڵکەکان، یان کارگەکاندا دەکرد، بیریان لە تەواوکردنی قوتابخانە نەدەکردەوە، بەڵکو بیریان دەکردەوە کە چی زووترە لە شوێنی ئیشێکدا ببن بە شاگرد.

گەورەترین کێشەی فازیل بەگی بەڕێوبەر، کە لە زۆربەی ئەو ڕۆژانەی سەرپێچییەک، یاخود یاخیبوونێک لە قوتابخانەدا ڕووی دەدا پۆلیسی بۆ قوتابییەکان بانگ دەکرد، ئەوە بوو کە نێوانی ئەو منداڵانەی لە ڕیزەکانی پێشەوە دانیشتبوون و لە خێزانێکی باشەوە هاتبوون لەگەڵ قەرەباڵغیی خوێندکارە بێدەرامەتەکاندا بگونجێنێت و پەیڕەوی یاسا بکات. لەبەر ئەوە

لـه کاتـی ڕێوڕەسـمی ئاڵاهەڵکردنـدا فەلسـەفەیەکی بـۆ خـۆی داهێنابـوو، کـە وەک ئامۆژگارییەکـی واتـادار دەری دەبـڕی: "پەروەردەیەکـی بـاش، جیاوازیـی نێـوان هـەژار و دەوڵەمەنـد ناهێڵێت!" مەولـود تێنەگەیشتبوو کە فازیل بـەگ بـەم وتەیـەی دەیویسـت بـە خوێنـدکارە هـەژارەکان بڵێـت، "ئەگـەر بـاش بخوێنـن و خوێنـدن تـەواو بکـەن، ئێـوەش دەوڵەمەنـد دەبـن؟" یاخـود مەبەسـتی ئـەوە بـوو، "ئەگـەر بـاش بخوێنن، ئـەوا چەنـد هەژاریش بن پێتانـەوە دیـار نابێـت؟"

بەڕێوبـەر بـۆ ئـەوەی بـۆ هەمـوو تورکیـای بسـەلمێنێت کـە پـەروەردەی ئامادەییـی ئەتاتورکـی کـوڕان زۆر باشـە، دەیویسـت تیپـی ئامادەییەکـەی نمرەیەکـی بـاش بەدەسـت بهێنـن لـە پێشـبڕکێی زانیـاری ئامادەییەکانـدا لـە ڕادیـۆی *ئیستانبوڵ*. بـۆ ئـەوەی مێـژووی لەدایکبـوون و مردنـی پاشـاکانی عوسـمانییان پـێ ئەزبـەر بـکات و بـەم ئامانجـەی بـگات، زۆرینـەی کاتـی لەگـەڵ ئـەو تیپـەدا بەسـەر دەبـرد کـە دروسـتی کردبـوون لـە قوتابخانـە و زۆربەیـان منداڵـی خێزانـە باشـەکانی گەڕەکەکـەی سـەرەوە بـوون، (لەنێـوان خوێنـدکارە تەمبـەڵ و ئیرەییکەرەکانـدا بـە خوێنـدکارە ئەزبەرکـەرەکان ناویـان دەبـردن). لـە ڕێوڕەسـمی ئاڵاهەڵکردنـدا بـە شـێوەیەکی نەفرەتـی باسـی لـەو خوێنـدکارە کۆنانـە دەکـرد کـە بـۆ شـاگردیکردنی چاککـەرەوە و لەحیمچـی وازیـان لـە خوێنـدن هێنابـوو، وەک بڵێـی خیانەتیـان لـە ڕووناکبیـری و زانسـت کردبێـت؛ سەرزەنشـتی ئـەو خوێندکارانـەی دەکـرد کـە وەک مەولـود هـەم دەچـن بۆ قوتابخانە، هـەم دوای نیوەڕۆ دەچن بۆ ماستفرۆشتن؛ بۆ ئـەوەی ئەو قوتابییانە بهێنێتـە سـەر ڕێگـەی

ڕاست کە تووشی دەردی پارەپەیداکردن بوون، هاواری دەکرد، "زانست تورکیا ڕزگار دەکات، نەک چێشتفرۆش و گەسفرۆش و کەبابفرۆشەکان!" ئەنیشتاینیش هەژار بوو؛ هەتا لە قۆناغی ناوەندیدا لە وانەی فیزیادا دەر نەچووبوو و لە پۆلەکەیدا مابووەوە، بەڵام بۆ ئەوەی سێ-چوار فلس پەیدا بکات، هیچ کاتێک دەستبەرداری قوتابخانەکەی نەبووە، لە کۆتاییدا ئەوەی سەرکەوتنیشی بەدەست هێناوە ئەو و گەلەکەی بووە.

***

**ئێسکەپەیکەر:** لەبەر ئەوەی بەهەڵە لە قسەکانی بەڕێوبەرەکەمان تێنەگەن کە بە نیەتێکی باشەوە دەیکرد، بۆ ئەوەی هانی قوتابییەکان بدات بخوێنن، بە مۆڵەتی ئێوە منیش دێمە نێوانەوە. لە ڕاستیدا ئامادەییەکەمان، ئامادەیی ئەتاتورکی کوڕان لە دوتتەپە، بۆ ئەوە دروست کرابوو کە ئەو منداڵی کارمەند و پارێزەر و پزیشکە هاوچەرخ و ئەوروپاییانە پەروەردەیەکی باشی تێدا وەر بگرن، کە لە گەڕەکی مەجیدییەکوێی[1] و دەوروبەریدا لە گەڕەکەکانی سەرەوەدا لە ئەپارتمانی هاوبەشیی بازرگانییەکاندا دەژیان. بەڵام بەداخەوە کاتێک کەوتە بەر لێشاوی کۆمەڵێکی زۆر لە منداڵانی هەژاری ئەنادۆڵو، کە لەو گەڕەکە بێتاپۆیانەوە هاتبوون کە لە دوایین دە ساڵدا، بەتایبەتی دوای ساڵەکانی ۱۹۷۰ لە گردە چۆڵەکانی پشتەوە بە شێوازێکی نایاسایی

---

١ مەجیدییەکویی: گەڕەکێکە لە ئیستانبول لە بەری ئەوروپا.

دروست کرابوون و بڵاو ببوونەوە، لەبەر ئەوە بەڕێوەبردنی ئەم ئامادەیییە جوانە کەوتە بارێکی ئاستەمەوە. سەرەڕای ئەوەی زۆرێک لە خوێندکارەکان دەر کرابوون لە قوتابخانەکەماندا، بە هۆی ئەوەی فرۆشیارییان دەکرد و نەدەهاتن بۆ قوتابخانە، یان دەستیان دەکرد بە کارێک و ناوی خۆیان دەسڕییەوە لە قوتابخانە، بە هۆی دزێتی و پەلامارادان، یاخود تاوانی وەک هەڕەشەکردن لە مامۆستا و دەستدرێژیکردنە سەری، هێشتا پۆلەکەمان لێوانلێو بوو لە خوێندکار. لەو پۆلە هاوچەرخانەدا کە بۆ سی خوێندکار دروست کرابوون، بەداخەوە دەیڵێم کە پەنجاوپێنج کەس وانەی تێدا دەخوێنێت، لەسەر هەر کورسییەکی دووکەسی، سێ خوێندکار دادەنیشێت، ئەوانەی لە کاتی پشووەکاندا بەبێ وەستان ڕایان دەکرد و یارییان دەکرد، وەک ئۆتومبێل بەر یەک دەکەوتن. بەداخەوە دەیڵێم کە قۆڵۆنیا دەدەین بە ژووری مامۆستایان، چونکە کاتێک جەڕەس لێ دەدات، شەڕێک دروست دەبێت، یاخود شڵەژاوییەک دروست دەبێت، ئەوکات بەکاری دەهێنن بۆ هۆشهێنانەوەی ئەو خوێندکارە بێهێزانەی کە دەبووریێنەوە بە هۆی کەوتنەژێر دەست و پێوە لە ئەنجامی قەرەباڵغیی ناو هۆڵ و سەر پلیکانەکانەوە. لە ناوەندێکی ئەوەندە قەرەباڵغدا بەدڵنیاییی ئەگەر بە شێوازی پێلەبەرکردن وانە بە خوێندکار بڵێیت کاریگەرترە، وەک لە شێوازی تێگەیاندن. چونکە لەبەرکردن هەم یارمەتیی گەشەسەندنی زەینی خوێندکار دەدات، هەم فێری ئەوەی دەکات ڕێز لە گەورەکانی بگرێت. کتێبەکانی وەزارەتی پەروەردەشمان بە هەمان لۆژیک نووسراوە. تورکیا پێک

دێت لە پێنج ناوچە. ورگی مانگا لە چوار بەش دروست کراوە. جەنگی پرێڤەزەی دەریایی ساڵی ١٥٣٨ جیا دەبێتەوە بۆ دوو قۆناغ. لە دونیادا پێنج قارە هەیە، حەوت خاڵ هەیە لە ڕێکەوتنی کارلۆفچەی ساڵی ١٦٩٩دا. دەوڵەتی عوسمانی، داگیرکردنەکان بە هۆی پێنج هۆکارەوە چۆتە قۆناغی شۆڕشێکی وەستاوەوە. ئەلفبێی تورکی بیستونۆ پیتە، لەناو ئاویشدا دوو توخم هەیە.

***

مەولود لە پۆلی یەک و نیوەی پۆلی دووی ناوەندیدا، تووشی دڵەڕاوکێیەکی زۆر بوو، کە ئایا لەکوێدا دابنیشێت. ئەو کاتانەی کە هەوڵی دەدا ئەم کێشەیە چارەسەر بکات تووشی قەیران و گرژی دەبوو، وەک فەیلەسووفە کۆنەکان کە دەگەڕێن بۆ وەڵامێک لەبارەی: ئایا پێویستە چی بکەیت لە ژیاندا. لە ساڵی یەکەمی دەستپێکردنی قوتابخانەیدا، هەر وەک چۆن بەڕێوبەر دەیوت، "ئەگەر ببیت بە پیاوی زانست، کە ئەتاتورک شانازیت پێوە بکات." تێگەیشتبوو کە پێویست دەکات هاوڕێیەتیی منداڵی ئەو خێزانە باشانەی گەڕەکەکەی سەرەوە بکات، کە دەفتەرەکانیان و بۆینباخەکانیان و ئەرکەکانی ماڵەوەیان بەڕێکوپێکی دەکرد. مەولود هێشتا ڕێکەوتی خوێندکارێکی نەکردبوو (لە سێ بەش، دوو بەشی خوێندکارەکان) کە هەم وەک خۆی دانیشتووی خانووی بێتاپۆ بێت و هەم لە وانەکانیدا زۆر سەرکەوتوو بێت، بەڵام لە باخەکەدا ڕێکەوتی چەند خوێندکارێکی کردبوو،

کە قوتابخانەیان بەجیددی گرتبوو، لەبەر ئەوەی وەک خۆی پێیان وتبوون، "بەڕاستی ئەم منداڵە زۆر ئاقڵە، با بخوێنێت،" سەرەڕای ئەوەی ئەم خوێندکارانە لە گەڕەکی خانووە بێتاپۆکاندا دەژیان، بەڵام نەیتوانیبوو پەیوەندی دروست بکات لەگەڵ قەرەباڵغیی قیامەتیی ئامادەییەکە و ئەو خوێندکارە ڕۆحتەنهایانەی کە لە قوتابخانە نزمیان دەکردنەوە و ناویان دەبردن بە "مانگا[١]." ئەمەش هۆکارەکەی ئەوە بوو کە "مانگا"کان بە چاوی گومانەوە سەیری مەولودیان دەکرد، بەتەنها لەبەر ئەوەی وەک ئەوان لە خانووی بێتاپۆدا دەژی. مەولودیش تێدەگەیشت کە تێڕوانینە زۆر گەشبینەکەی مانگاکان بەرامبەر بە ژیان بۆشە: لە ڕاستیدا هەستی دەکرد کە ئەم منداڵە "عاقڵانە" گەمژەن، کە وایان دەزانی ئەگەر کتێبی جوگرافیای پۆلی یەکی ناوەندی لەبەر بکەن، لە داهاتوودا دەوڵەمەند دەبن، لەبەر ئەوە هیچکات نەیدەویست لەوان بچێت.

هاوڕێیەتیکردنی لەگەڵ هەندێک منداڵی خێزانە باشەکان کە لە پۆلدا لە ڕیزەکانی پێشەوەدا دادەنیشتن، دانیشتنی لەتەنیشت ئەوانەوە، دەبووە هۆی ئەوەی مەولود زیاتر هەست بە دڵخۆشی و باشیی خۆی بکات. بۆ ئەوەی بچێتە ڕیزی پێشەوە، دەبووایە بەردەوام سەیری ناو چاوی مامۆستاکانی بکردایە، کۆتاییی ئەو ڕستانەی یەکسەر لە دەمی مامۆستاکان وەر گرتایەتەوە کە دەستیان دەکرد بە وتنی، بەڵام بە لۆژیکی پەروەردە کۆتاییەکەیان نەدەوت، لەگەڵ ئەوەشدا دەبوو بە دەنگێکی بەرز بیوتنایە. کاتێک

١ مانگا: بەو خوێندکارانە دەوترێت کە بە ڕێژەیەکی زۆر سەعی دەکەن.

مامۆستا پرسیارێکی دەکرد، ئەگەر مەولود وەڵامەکەشی نەزانیبایە بە شێوەیەکی جوان بەبەردەوامی پەنجەی بەرز دەکردەوە، وەک بڵێی وەڵامەکەی بزانێت. بۆ نموونە مامۆستای مێژوو ڕامسیس(بەڕاستی لە مۆمیا دەچوو) دەیوت، "ئەتاتورک، وتبووی چەند دڵخۆشییە کە چیم؟" مەولود یەکسەر ڕستەکەی تەواو دەکرد، "کە تورکم!" ئەگەر ڕامسیس نەیشیوتایە، "ئافەرین" بە سەیرکردنەکەیدا یەکسەر دیار بوو کە مەولودی پەسەند کردووە... مەولود وەک ئەوەی کە لە قوتابخانەکەی لەدێدا دەیکرد، لە وانەکاندا دەستەکانی دەخستە سەر سنگی، بێ ئەوەی هیچ جوولەیەک بکات، وەک پەیکەر دادەنیشت، بەردەوام پەنجەی هەڵدەبڕی، هەندێک جار خۆی بۆ نەدەگیرا بانگی دەکرد، "مامۆستا، مامۆستا، من!" لە سایەی ئەم هەڵسوکەوتە نیەتباشانەیەوە، وەک سەلمێنەرێکی قسە دڵخۆشکەرەکەی بەڕێوبەر، کە دەیوت پەروەردەی باش جیاوازیی نێوان دەوڵەمەند و هەژار ناهێڵێت، ئەگەر کاتییش بێت، لە ڕیزەکانی پێشەوە شوێنێکی بۆ خۆی دەدۆزییەوە.

بەڵام ئەو منداڵانەی ئەپارتمانەکانی گەڕەکەکەی سەریشەوە، کە مەولود دەیویست بچێتە ناویانەوە، زۆر سەیر بوون، لەوانە بوو هەرساتێک دڵی مرۆڤ بشکێنن. لە پۆلی یەکی ناوەندیدا، مەولود لەگەڵ زاوا، کە تایبەتمەندێتیی ئەوەی بەدەست هێنابوو لە ڕیزی پێشەوەدا لەتەنیشتیەوە دابنیشێت، لە ڕۆژێکی بەفراویدا لە مەیدانی پشووداندا هەردووکیان لە مەترسیی بوونبەژێر دەست و پێوە ڕزگاریان ببوو لەناو ئەو قەرەباڵغییەدا کە یاریی تۆپی پێیان دەکرد، (بە تۆپێک کە لە ڕۆژنامەی کۆن دروست کرابوو، پەستێنرابووەوە و بە دەزوو

دوورابوو، چونکە قەدەغە بوو تۆپی پێ ببەیت بۆ قوتابخانە) بەشێتی ڕایان دەکرد، هاواریان دەکرد، قوماریان دەکرد (بە وێنەی یاریزانەکان و قەڵەمی بچووک و ئەو جگەرانەی کە کرابوون بە سێ پارچەوە). کاتێک زاوا بۆ ساتێک تووڕە بووبوو، ئاوڕی دابووەوە بۆ مەولود، وتبووی، "لادێییەکان ئەم قوتابخانەیەیان پڕ کردەوە، باوکم ناونووسییەکەم لەم قوتابخانەیە هەڵدەگرێت، دەچم بۆ قوتابخانەیەکی تر."

مەولود ئەو ڕۆژە تێگەیشتبوو کە زاوا سەرەڕای ئەوەی سکاڵا لەو قوتابییانە دەکات کە لە خانووە بێتاپۆکانەوە هاتوون، هیچ درکی نەکردووە، بە خەیاڵیشیدا نەهاتووە کە ئەو هاوڕێیەی بەردەوام لەتەنیشتیەوە دادەنیشێت لە خانووی بێتاپۆوە هاتووە.

***

**زاوا:** بە شێوەیەک هەڵسوکەوتم لەگەڵ مەولوددا دەکرد، وەک بڵێی نازانم کە تازە لە لادێوە هاتووە، لە خانووی بێتاپۆدا دەژی، مەولود ئەم هەڵسوکەوتەی وەک جۆرە هەستناسکی و بەڕێزییەک وەر دەگرت. بە ڕێژەیەکی زۆر گرنگیم دەدا بەوەی کە چاکەتەکەم و بۆینباخەکەم کەشخە بن، لەبەر ئەوەی هەندێک بەیانی قۆڵۆنیای ڕیشتاشینەکەی باوکم - کە پزیشکی ژنان بوو - بە ڕێژەیەکی زۆر دەدا لە خۆم و دەهاتم بۆ ناو پۆل، لە یەکەم مانگی قوتابخانەدا ناویان نام زاوا. بۆنەکە ئاسوودەیی دەدا بە هەموو خوێندکارەکان، چونکە پۆلەکەمان بۆنی پیسیی هەناسە و ئارەقەی لێ دەهات،

ئەو ڕۆژانەی قۆڵۆنیام لە خۆم نەدایە، دەیانپرسی، "زاوا، ئەمڕۆ شایی نییە؟" من کەسێک نیم یەکسەر دڵم بشکێت، وەک ئەوەی هەندێک بەو جۆرە تێم دەڕوانن. جارێکیان یەک مستەکۆڵەی بەهێزم دابوو بە چەناگەی سەرسەرییەکدا، چونکە بە بیانووی ئەوەی کە بەباشی بۆنی قۆڵۆنیاکە بکات بەگاڵتەجارییەوە لووتی هێنابوو بەرەو ملم، وەک بڵێی من حیز بم، ئەوکات بەڕێزیم بەدەست هێنابوو لای خوێندکارە ئازاکان کە لە ڕیزی دواوە دادەنیشتن. لەبەر ئەوەش لەم قوتابخانەیەدا دەخوێنم، چونکە باوکە ڕەزیلەکەم پارەی نەدەدا تا لە قوتابخانەی تایبەت بخوێنم.

ڕۆژێکیان خەفەتمان هەڵدەڕشت لەسەر ئەم بابەتانە، لەو کاتەدا مامۆستای بایۆلۆجی، مەلاحەتە زلە، وتبووی، "١٠١٩، مەولود کاراتاش، زۆر قسە دەکەیت، بچۆرە دواوە!"

منیش وتبووم، "مامۆستا ئێمە هیچ قسەمان نەکردووە!" ئەمەم لەبەر ئەوە نەوت (وەک مەولوود پێی وا بوو) کە ڕۆحێکی جوامێرانەم هەیە، لەبەر ئەوەی دەمزانی کە مەلاحەت هیچکات خوێندکارێکی وەک من نانێرێتە ڕیزی دواوە، چونکە منداڵی خێزانێکی باشم.

***

بەڵام مەولود لەبەر ئەوەی نێردرایە ڕیزەکەی دواوە، زۆر زویر نەبوو. لەوەوبەریش نێردرابووە ڕیزی دواوە، بەڵام بە هۆی بەڕیزی و پاکی و سیما منداڵئاساکەیەوە و بەردەوام پەنجەبەرزکردنەوەی لە پۆلدا، دەیتوانی ڕێگایەک بدۆزێتەوە و

بچێتەوە ڕیزی پێشەوە. هەندێک جار مامۆستایەک بۆ ئەوەی بەرگری لە ژاوەژاوەکەی ناو پۆلەکە بکات، جێگۆڕکێی بە هەموو پۆلەکە دەکرد. کاتێک مەولودی سیماشیرین لەو ساتانەدا بە ویستێکی زۆر و ملکەچییەوە سەیری ناو چاوی مامۆستاکەی دەکرد، دەیتوانی ئەوە بەدەست بهێنێت کە لە پێشی پێشەوە دابنیشێت، بەڵام دواتر بێشانسی دووبارە دەبووە هۆکاری ئەوەی کە بینێرنەوە ڕیزی دواوە.

جارێکیان زاوا بەبەجەرگییەوە بەرهەڵستیی لە مامۆستای بایۆلۆجی، مەلاحەتە مەمکزل، کردبوو، کاتێک بڕیاری دابوو مەولود بنێرێتە ڕیزی دواوە.

"مامۆستا، با لە پێشەوە دابنیشێت. چی دەبێت، وانەکەی ئێوەی زۆر خۆش دەوێت."

مەلاحەتەی زاڵم وتبوی، "نابینیت، بالایەکی پێوەیە دەڵێی درەختە. ئەوانەی دواوە بە هۆی ئەوەوە ناتوانن تەختەکە ببینن."

مەولود بەگوێرەی تەمەنی گشتیی خوێندکارەکان لە پۆلدا، گەورەتر بوو، چونکە دوای ئەوەی خوێندنی سەرەتایی تەواو کردبوو باوکی بەبێ هۆ ئەوی ساڵێک لە لادێ هێشتبووەوە. جەستەیەکی زۆر گەورەتریشی هەبوو بە بەراورد بە جەستەی هاوتەمەنەکانی. کاتێک لە ڕیزی پێشەوە دەگەڕایەوە بۆ ڕیزی دواوە، شەرم دای دەگرت، مێشکی پەیوەندییەکی سەیری دروست دەکرد لەنێوان جەستە زلەکەی و خووی دەستپەڕکردنیدا، کە تازە فێری ببوو. کاتێک مەولود دەگەڕایەوە ڕیزەکانی دواوە، ئەوانەی دواوە بە چەپڵە و بە وتافی، "مەولود بۆ لانەی خۆت!" پێشوازییان لێ دەکرد.

ڕیزەکانی دواوە شوێنی چەتە، تەمبەڵ، بێمێشک، بەهێزە زلجەستەکان، پیرەکان، نائومێدەکان بوو، کە ئەمەندە مابوونەوە سەریان گێژی دەخوارد، لەگەڵ ئەوەشدا شوێنی ئەو قوتابییانە بوو کە لە داهاتوویەکی نزیکدا لە قوتابخانە دەر دەکران. هەندێک جار لەناو ئەوانەی کە دەنێردرانە دواوە، ئەو خوێندکارانەشی تێدا بوو کە کارێکیان دەدۆزییەوە و وازیان لە قوتابخانە دەهێنا، بەڵام هەندێ قوتابی جگە لە قوتابخانە هیچ کارێکی تریان بۆ نەدۆزرایەوە و لە ڕیزەکانی دواوەدا پیر دەبوون. هەندێکیان هەر لە ڕۆژانی سەرەتای قوتابخانەوە خۆیان دەچوون لە ڕیزی دواوەدا دادەنیشتن، چونکە دەیانزانی تاوانبار و گەمژەکان پیر یاخود کەتە و زلن. هەندێکی تر کە وەک مەولود بوون، بە هیچ شێوەیەک نەیاندەتوانی قبوڵی ئەوە بکەن کە ڕیزەکانی دواوە چارەنووسێکی خراپە بۆیان، وەک هەندێک هەژار چۆن دوای هەوڵێکی زۆر و خەیاڵڕووخان، لە کۆتاییی ژیانیاندا ئینجا لە ڕاستییە بەئازارەکە تێدەگەن، کە هیچکات دەوڵەمەند نابن. قوتابییەکانی دوو ڕیزی دوای دواوە تێکڕای تەمەنیان چواردە و نیو بوو، بەگوێرەی حسابێک کە مەولود یەک جار کردبووی (بە بەراورد بەوەی کە تەمەنی خوێندن لە پۆلی یەکی ناوەندی، دوانزەیە) زۆر لە مامۆستاکان بە ئەزموون دەیانزانی کە بێهوودەییە کار بکەیت بۆ ئەوەی ئەوانەی دواوە فێری شتێک بکەیت، لەسەرووشیانەوە مامۆستای مێژوو، ڕامسێس (بەڕاستیش لە مۆمیا دەچوو)، هەندێکی تریشیان لەبەر ئەوەی دەترسان (بۆ نموونە: مامۆستای ئینگلیزی ئێدا خانی گەنج و ترسنۆک، کە مەولود لە ڕیزی پێشەوەدا

چـاوی دەخسـتە نـاو چاویـەوە و زۆر دڵخـۆش دەبـوو، بـێ ئـەوەی درکـی پـێ بـکات عاشـقی ببـوو) کـە بکەونـە شـەڕەوە لەگـەڵ ڕیـزی دواوەدا، دەترسـان لـەوەی لەگـەڵ خوێندکارێکدا بکەونـە مناقەشـەوە، زۆر جـار بـە هیـچ شـێوەیەک سـەیری ئـەو ئاراسـتەیەیان نەدەکرد. مەولـود لـە مانگەکانی سـەرەتای پۆلی یەکدا، لەبەر دڵخۆشیی ئەوەی کە لەگەڵ مامۆستا ئێدا خانمـدا چاویـان بچێتـە سـەر چـاوی یـەک، زۆر ویسـتبووی لـە ڕیزەکانـی پێشـەوە دابنیشـێت.

هیـچ مامۆسـتایەک نەیدەویسـت ڕێـک و ڕاسـت لەگـەڵ ئەوانـەی دواوەدا بکەوێتـە بەریەککەوتنـەوە، هەتـا بەڕێوبەریـش کـە دەیتوانـی هـەزار و هەشـت سـەد خوێنـدکار پێکـەوە بترسـێنێت، نەیدەویسـت بکەوێتـە دۆخێکـی وەهـاوە، چونکـە ئـەم گرژییانـە لەوانـە بـوو بەخێرایـی ئاراسـتەیەکی خوێنـاوی وەر بگرێـت، لەوانـە بـوو نـەک هـەر بەتەنهـا ڕیزەکانـی دواوە، بەڵکـو هەمـوو پۆلەکـە پەلامـاری مامۆسـتاکەیان بدایـە. ئـەو بابەتـەی کـە هەمـوو پۆلەکـەی تـووڕە دەکـرد، ئـەوە بـوو کـە مامۆسـتاکان گاڵتەیـان بـە شـێوازی قسـەکردن و تەمبەڵـی و زیبکـە سـوورەکانی سـیمای ئـەو خوێندکارانـە دەکـرد کـە لـە خانـووە بێتاپۆکانـەوە هاتبـوون. لەبـەر ئـەوەی هەندێـک خوێنـدکار بـەردەوام گاڵتەجاڕییـان دەکـرد وەک بڵێـی مامۆسـتا زیـاد لەوانـە، چیرۆکێکـی ڕابـواردن بـاس دەکات، مامۆسـتاکان دەیانویسـت بـە لێدانیـان بـە ڕاسـتە، بـە سـووککردنیان بێڕێـز و بێدەنگیـان بکـەن. سـەردەمێک مامۆسـتای کیمیـا، فـەوزی خۆدەرخـەر، کـە هەمـوو کـەس ڕقـی لێـی بـوو، چونکـە گاڵتـەی بـە شـێوازی قسـەکردن و جلوبەرگی خوێندکارێکی ڕۆژهەڵاتی

(ئەو سەردەمە کەس نەیدەتوانی وشەی کورد بەکار بهێنێت) کردبوو، هەموو جارێک کە ڕووی کردبووە تەختەکە بۆ ئەوەی شێوازی پێکهاتەی قورقوشم بنووسێت، لەسەر تەختەڕەشەکە ببووە نیشانەیەک بۆ خوێندکارەکانی تر و ئەوانیش بە قەڵەمجافی ناوبۆش، کە فوویان پێدا دەکرد، دەیان دەنکە برنجیان بۆ هاویشتووە، لە ئەنجامدا ئەو دەنکە برنجانە وەک دەستڕێژی فیشەک بەسەریدا باریون.

بەهێزەکانی ڕیزەکانی دواوە، هەندێک جار لەبەر ئەوەی کە دەیانزانی مامۆستاکە بێهێز و ترسنۆکە، هەر بۆ خۆشی و کەیفی خۆیان دەیانترساند، هەندێک جاریش هەر بەئارەزوو قسەیان بە مامۆستاکەیان دەبڕی:

"ئیتر بەسە مامۆستا، ئەم وانەیە زۆر درێژەی کێشا، بێزار بووین، کەمێکیش باسی گەشتەکەتمان بۆ بکە، ئەوەی ئەورووپا دەڵێین!"

"مامۆستا، بەڕاستی تۆ بە تاقی تەنها بە شەمەندەنەفەر تاکو ئیسپانیا چوویت؟"

ئەوانەی دواوە، وەک ئەوانەی لە هاویناندا لە سینەمای باخەکاندا، بەبەردەوامی لەبارەی فیلمی سەر پەردەکەوە قسە دەکەن، لە پۆلدا بە دەنگێکی بەرز بەبێ وەستان قسەیان دەکرد لەبارەی دۆخی ناو پۆلەکەوە، چیرۆکیان دەگێڕایەوە، هەموویان پێکەوە بەژاوەژاوەوە قاقایەکی وایان لێدەدا، هەندێک جار مامۆستاکەی سەر تەختەکە کە پرسیاری دەکرد، لەگەڵ خوێندکارەکەی پێشەوە کە وەڵامی دەدایەوە گوێبیستی یەکتر نەدەبوون. هەموو جارێک کە مەولود دەنێردرایە ڕیزی دواوە، بەئەستەم دەیتوانی گوێبیستی ئەو

بابەتە ببێت کە مامۆستا باسی دەکات. بەڵام با بەهەڵە تێنەگەن، بەنیسبەت مەولودەوە دڵخۆشترین ساتی قوتابخانە ئەوە بوو کە هەم بە سوعبەتەکانی ئەوانەی دواوە پێبکەنێت، هەم گوێگرتنی بوو لە مامۆستا ئێدا.

***

**مستەفا ئەفەندی:** هەڵبەتە مەولود لە هاویندا لەگەڵ مندا هاتەوە بۆ لادێ. لە پاییزی داهاتوودا کە مەولود لە پۆلی دووی ناوەندی بوو لە ئیستانبوڵ، هێشتا شەرمی دەکرد لە کۆڵانەکاندا هاوار بکات، "ماااستفرۆش هات!" بەڵام ئیتر ڕاهاتبوو لەگەڵ ئەوەی دارەکە بخاتە سەر شانی و سەتڵی ماست و مەنجەڵی بۆزا هەڵبگرێت. وەک ئاگادارم کردبوو دوای نیوەڕوان، لە چێشتخانەیەکی کۆڵانەکانی پشتەوەی بەیئۆغڵووەوە[1] سەتڵە بەتاڵەکانی هەڵدەگرت دەیگواستەوە بۆ گەنجینەکەی سیرکەجی[2]، دواتر ئەو سەتڵە پڕانەی کە لە گەنجینەکە هەڵی دەگرت، یاخود مەنجەڵە بۆزا خاوەکانی کە لە دوکانی وەفا هەڵی دەگرت لە بەیئۆغڵو، لە شوێنی ئیشی ڕاسیم دای دەنا، کە بۆنی ڕۆن و پیازی سوورەوەکراوی لێ دەهات، دواتر دەگەڕایەوە بۆ دوتتەپە. هەندێک شەو لەگەڵ مندا دەهات بۆ بۆزافرۆشتن، هەندێک شەویش کاتێک مەولود لە ماڵەوە دەمایەوە، لەگەڵ خێودا سەعیی لە وانەکانیدا دەکرد، پاشان خەوی لێ دەکەوت. کە خێوەکە

---

[1] بەیئۆغلو: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئەورووپا.
[2] سیرکەجی: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئەورووپا.

دەیبینی مەولود خەوی لێ کەوتووە، لە پەنجەرەکەوە دەهاتە ژوورەوە و دەچووە ناو خەوی مەولودەوە. کاتێک شەوان دەهاتمەوە بۆ ماڵەوە، ئەگەر مەولودم ببینیایە هێشتا لەسەر مێزەکە سەعی دەکات، دەمگوت، "ئەگەر بەم شێوەیە بڕوات، ماشەڵلا تۆ دەبیت بە یەکەم پرۆفیسۆر لە لادێکەی ئێمەدا." ئەگەر بەباشی سەعیی کردبێت دەیوت، "باوکە ئێستا دەتوانیت گوێم لێ بگریت،" چاوەکانی دەبڕییە سەقفەکە، بەئەزبەر دەستی دەکرد بە خوێندنەوەی ئەرکی وانەکەی. کە لە شوێنێکدا دەوەستا، چاوی لە سەقفەکەوە وەر دەگێڕا بە ڕووی مندا. دەمگوت، "کوڕم چاوەڕێی یارمەتی مەکە لە باوکتەوە کە خوێندەواریی نییە، ئەزبەرەکەت لە سیمای مندا نەنووسراوە." لە دووهەم ساڵی خوێندنی ناوەندیدا، هیچ سارد نەبیووەوە نە لە قوتابخانە، نە لە فرۆشیاری. هەندێک شەو دەیوت، "بەیانی قوتابخانە نییە لەبەر ئەوە لەگەڵتدا دێم بۆ بۆزافرۆشتن!" دەنگم نەدەکرد. هەندێک ڕۆژیش دەیوت، "بەیانی سەعیم هەیە، من لە قوتابخانەوە ڕێک دێمەوە بۆ ماڵەوە." نەمدەوت ئەگەر بەو شێوەیە بڕوات ئێمە نەک لە ئیستانبوڵ، بەڵکو لە لادێش نابین بە خاوەنی خانوویەک. چونکە کوڕەکەم هەرچییەکی پەیدا دەکرد دەیدا بە باوکی خۆی. وەک کۆرکوت و سولەیمانی کوڕەکانی مامی، بە بیانووی پارەی دەفتەر و کتێبەوە هیچ پارەی خەرجی لە باوکی نەدەسەند.

***

مەولود، وەک زۆرینەی خوێندکارەکانی ئامادەییی ئەتاتورکی کوڕان، وەک نهێنییەک ژیانی دەرەوەی قوتابخانەی دەشاریتەوە، دوای ئەوەی لە کۆتا وانەیدا دەهاتە دەرەوە، تەنانەت لەگەڵ ئەو خوێندکارانەی کە وەک خۆی فرۆشیاریان دەکرد هاوبەشی لێدوانی ئەو کارانەی نەدەکرد کە دەیکرد. هەندێک جار خوێندکارێکی دەبینی، بۆ نموونە وەک نوسرەتی خەڵکی ساریقایا، کە لەگەڵ باوکیدا لە کۆلانەکاندا ماستی دەفرۆشت، بەلام بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی دەکرد وەک نەیبینیبێت، کە رۆژی دواتر لە پۆلدا رێکەوتی یەکتریشیان دەکرد، بە جۆرێک هەڵسوکەوتی دەکرد وەک بڵێی هیچ شتێک نەبووبێت. بەلام بەئاگاوە تێی دەڕوانی، کە ئایا منداڵەکە چۆن سەعی دەکات، لە پۆلدا بە شێوەیەک دەبینرێت کە فرۆشیارە یاخود نا، بیری دەکردەوە و لە خۆی دەپرسی، ئەو لە داهاتوودا دەبێت بە چی، لە ژیاندا چی دەکات. هاوڕێیەکی پۆلەکەشی بینیبوو کە خەڵکی ئەرزینجان[1] بوو، لە کۆلانەکانی پشتەوەی شیشلیدا عەرەبانە سێتایەکەی پاڵ پێوە نابوو، لەگەڵ باوکیدا سێو و پرتەقاڵی فرۆشتبوو، بەلام لەبەر ئەوەی هاوڕێکەی لەلایەن باوکیەوە سەرزەنشت کرابوو، بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی کردبوو وەک بڵێی نەیبینیبێت. مەولود لە کۆتاییی ساڵیشدا لە تارلەباشی[2] سەرەنجی ئەو خوێندکارەی دابوو کە خەڵکی ماردین[3] بوو، لەگەڵ باوکیدا لغاوی ئەسپی عەرەبانەکەی گرتبوو، کۆلانبەکۆلان دەگەڕان ڕۆژنامەی کۆن و شووشەی

---

١ ئەرزینجان: شارێکە لە باکووری کوردستان.

٢ تارلاباشی: گەڕەکێکە لە ئیستانبول، لە بەری ئەورووپا.

٣ ماردین: شارێکە لە باکووری کوردستان.

بەتاڵ و تەنەکەیان کۆ دەکردەوە. مەولود ڕۆژێک درکی کرد کە کەس لەبارەی ئەو منداڵەوە قسە ناکات کە دەربڕینێکی خەیاڵی لە سیمایدا بوو، لە وانەکاندا بەردەوام لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوەی دەکرد، ئیتر هیچ کەسێک بۆ یەک جاریش باسی ئەو ناکەن، یاخود باسی ونبوونی دوای چوار مانگ دەستکردن بە خوێندنی لە پۆلی دووهەمی ناوەندی و سەرنەدانی قوتابخانەی ناکەن. مەولود لە هەمان کاتدا تێگەیشت کە چۆن هەموو ئەو هاوڕێیانەی بیر چۆتەوە کە کارێکیان دۆزیوەتەوە و دەستیان کردووە بە شاگردێتی و وازیان لە خوێندنی ناوەندی هێناوە، مێشکی دوای ماوەیەکی کورت ئەویشی بۆ تاهەتایە بیر دەچێتەوە.

لەناکاو ونبوونی هاوڕێکانی پۆلەکەی، مەولودی هێنایە بارێک کە زیاتر قوتابخانەی خۆش بووێت، بۆ ئەوەی قوتابخانە وەک ماڵێک قبوڵ بکات، زیاتر پێویستی بەوە بوو کە لە مامۆستاکانی نزیک ببێتەوە. بەو شێوەیەش بێ ئەوەی درکی پێ بکات بەتەواوەتی بەسترایەوە بە مامۆستای ئینگلیزییەوە، کە ئێدا خانمی تەمەنگەنج بوو. ئێدا خانم پێستێکی سپیی هەبوو، چاوەکانی گەورە و سەوز بوون، ئەو بەرکۆشە نەخش گەڵا سەوزەی لەبەردا بوو، کە لە کتێبخانەکە لەبەری دەکرد لە کاتی نۆبەتداریدا. کاتێک وشەی ئینگلیزیی بەکار دەهێنا مەولود وای دەزانی ئەو لە دنیایەکی ترەوە هاتووە. مامۆستا ئێدا لەبەر ئەوەی مەراقی کتێبی هەبوو، هەندێک ڕۆژ کتێبخانەکەشی بەڕێوە دەبرد. مەولود زۆر بیری کردبووەوە کاتێک ئەو لە کتێبخانەکە دەبێت، بەتەنها بچێت بۆ کتێبهەڵگرتن، بەڵام کتێبخانەکە بۆ

قوتابییانی ناوەندی قەدەغە بوو. مەولود بەردەوام سەیری ناو چاوە سەوزە جوانەکانی دەکرد، بەعەشقەوە گوێی لە وانەکانی دەگرت، بەو هۆیەشەوە سەرنجی مامۆستای بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. کە نیوەی یەکەمی پۆلی دووی ناوەندی تەواو بوو، کاتێک بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو لەلایەن مامۆستا ئیداوە بڵاو کرایەوە کە مەولود هەڵبژێردراوە بۆ سەرۆکی پۆل، مەولود هەستی کرد ئەو عەشقە نهێنییەی بێبەرامبەر نییە، کە خۆیشی نەیدەتوانی دانی پێدا بنێت.

هەر وەک لە زۆربەی ئامادەییەکاندا هەبوو، لە ئامادەیی ئەتاتورکی کوڕانیشدا ئەرکی سەرۆکی پۆل، کە لە کۆندا پێی دەوترا نوێنەر، جگە لە کەمکردنەوەی دەردەکانی قوتابی و ئاسانکاری، بۆ ئەوە بوو یارمەتیی مامۆستا بدەن کە زاڵ بێت بەسەر پۆلەکەدا. بەڕێوبەرەکان دەیانزانی باشترین ڕێگەی لۆژیکیی (هەر وەک پاشاکانی عوسمانی کە هێزیان نەبوو بەسەر ناوچە دوور و شاخاوییەکاندا) کە مامۆستا پەیڕەوی بکات، لە کاتێکدا هێزی بەسەر قوتابییە سەرکێشەکان، یاسانەناسەکاندا نەشکایەتەوە، هاوبەشیکردنی دەسەلاتی بوو لەگەڵ بەهێزەکان و بەتەمەنەکانی ڕیزەکانی دواوەدا. لەبەر ئەوە سەرۆکی پۆل نەک لەلایەن قوتابییانەوە، بەڵکو لەلایەن مامۆستاکانەوە هەڵدەبژێردرا. هەندێک جار هەڵبژاردن دەکرا بۆ ئەوەی وەک هاوچەرخێک یان ئەوروپییەک ببینرێن، بەڵام نەک ژمارەی دەنگەکان، بەڵکو بەتەنها ناوی ئەو کەسە بڵاو دەکرایەوە کە بووە بە سەرۆک. هەڵبژاردنی مەولود بە سەرۆکی پۆل لە شوێنی خۆیدا بوو! لەبەر ئەوەی هەم لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشت، هەم بەگوێرەی قوتابییانی ناو پۆلەکە جەستەی زل و کەتە بوو.

کاتێک مامۆستا ئێدا وتی، "سەرۆکی پۆلەکەمان مەولود کاراتاشە." مەولود باوەڕی نەکرد، بێ ئەوەی هیچ گوێ بداتە تانەی قوتابییانی ڕیزەکانی دواوە وتی، "مامۆستا شەرەفێکی گەورەیە بۆ من." فەرمانەکەی پەسەند کرد. دڵی بەخێرایی لێی دەدا. سەرۆکی پۆل چەند ئەرکێکی زۆری هەبوو، وەک: نووسینی غیابات، هێورکردنەوەی ئەو قوتابییانەی کە هاروهاجی دەکەن پێش ئەوەی مامۆستا بێتە پۆلەوە، پشکینی زۆپاکە ئایا خەڵووزی تێدایە یاخود تێیدا نییە، کۆکردنەوەی ئەو یارمەتییانەی کە دەبەخشرێت بۆ یەکێتیی خێزان-قوتابخانە، مانگی سوور، ڕێکخراوی هەیکەلی ئەتاتورک. کاتێک سەرۆک ئەم کارانە دەکات، پارە کۆ دەکاتەوە، دەتوانێت مستەکۆڵەکانی بەکار بهێنێت. بەلام ئەرکی بنچینەیی سەرۆکی پۆل، ئەوە بوو کاتێک مامۆستاکان دەترسان لەوەی کە لە پۆلدا بە دەست یاخود ڕاستە لەو چەتانە بدەن کە بەقسەیان نەدەکردن، ئەگەری ئەوەشیان هەبوو کە وەلامیان بدەنەوە، ئەوکات سەرۆکی پۆلەکان دەیانتوانی بە شەپازللە و شەق و هەڕەشە ئەو چەتانە سەرکوت بکەن. زۆر لە خوێندکارەکان لە ڕیزەکانی دواوە ئامادە بوون کە ئەم خزمەتە بکەن بۆ ئەو مامۆستایانەی کە وەک مامۆستا ئێدا نەیاندەتوانی ناپابەندیی ژاوەژاوی ناو پۆلەکە ڕێک بخەن، هەندێکیان هەر لەخۆیانەوە لەناو پۆلدا هەڵدەستان بۆ یارمەتیی مامۆستا ژنەکان، شەقازللەیان دەدا بە پشتی ملی خوێندکارە منداڵەکاندا کە ئارامیی پۆلەکەیان دەشێواند، گوێچکەیان ڕادەکێشان دەیانهێنانە سەر ڕێگەی ڕاست. بەو شێوەیەش لە پۆلدا زۆر پارێزگاریکەری

پابەندیی وانەکانی مامۆستا ئیدای ناسک هەبوو، لەلایەن ئەو خوێندکارانەوە کە شەیدای بوون. بۆ ئەوەی مامۆستا ئیدا درک بەم خزمەتە بکات کە لە ناخی خۆبەخشەکانەوە دێت، پێش ئەوەی مستەکۆڵە بدەن بە ناوەڕاستی پشتی خوێندکارە ئاژاوەکەرەکەدا، بە دەنگێکی بەرز هاواریان دەکرد، "گوێ لە وانەکە بگرە گەمژە!" یاخود "بێڕێزی مەکە بەرامبەر مامۆستا!" ئەگەر مامۆستا ئیدا هیچ سەیری ڕیزەکانی دوایشەوەی نەکردایە، بەڵام مەولود هەستی بکردایە کە مامۆستا ڕازییە بەم خزمەتە، دەکەوتە ناو تووڕەیی و ئیرەیییەوە، خۆیشی دەیویست لە یەک-دوو ژاوەژاوکەر بدات. مەولود لەو ڕۆژانەدا فێر بوو کە دەتوانێت چەندەها جار یاسایەکی گرنگی ژیان پێشێل بکات: ئەگەر نەیەوێت ئازاری ئیرەیی بچێژێت، دەبووایە پەیوەست نەبووایە بەو ژنە جوانانەوە کە هەموو کەس بەدڵیەتی.

مەولود پێش ئەوەی بەتەواوەتی شانازی بکات بە سەرۆکبوونی پۆلەوە، ئێسکەپەیکەر سەرۆکی پۆلەکانی کۆ کردەوە و بۆی باس کردن کە ئیتر چەند ئەرکێکی نوێیان هەیە. بەڕێوبەرایەتیی قوتابخانە داهاتی کەم بوو، لەبەر ئەوە هاوبەشییەکی بازرگانی پێک هێنابوو، سمیتی دەفرۆشت بە قوتابییەکان. ئەو سمیتانەی کە دەیانفرۆشت زۆر پاک و تەندروست بوو. بەڵام قوتابییەکان سمیتی پیس و هەرزانیان لە فرۆشیاری کۆڵانەکان دەکڕی، کە بە درێژاییی دیوار و دەرگای قوتابخانە ڕیز ببوون. ئێسکەپەیکەر لە ڕێوڕەسمێکی ئاڵاهەڵکردندا بە هەموو قوتابییەکانی وتبوو کە میکرۆب و شتی پیس و نیشانەی تاعوون لەناو سمیتی فرۆشیاری

کۆلانەکاندا دۆزراوەتەوە، بەڵام زۆرینەی قوتابییەکان گوێیان لێ نەدەگرت. ئەرکێکی نوێی سەرۆکی پۆلەکان ئەوە بوو لە کاتی پشوودا بە درێژایی دیوارە نزمەکەی قوتابخانە، وەک پاسەوانی بەندیخانەیەک هاتوچۆ بکەن بۆ سەرەوە و خوارەوە، ڕێگری لەو قوتابییانە بکەن کە شت لە فرۆشیارەکان دەکڕن.

کاتێک ئێسکەپەیکەر ئەرکی پاسەوانێتیی دا بە سەرۆکی پۆلەکان، بەتەنها بنەمای ناڕێژەییی پەیڕەو کردبوو، وەک سوپای تورکیا و بیرۆکراتەکان چۆن پاسەوان-سەرباز-پۆلیسیان بە شێوەیەکی ناڕێژەیی دەنارد بۆ ئەو ناوچانەی کە کێشەیان تێدایە. کاتێک مەولود لە پشووە درێژەکەدا فریای دیواری باخەکە کەوت، قەرەباڵغییەکەی بینی، تێگەیشت کە ناتوانێت هیچ کەسێک بوەستێنێت. قوتابییە ئامادەییەکانی کە جەستەیان دوو هێندەی مەولود بوو، سمێڵیان هەبوو، سیمایان زیبکاوی بوو، بەزۆری شتیان لەو فرۆشیارانە دەکڕی کە لە تەمەنی باوکی مەولوددان. سمیتفرۆشەکان، لەبلەبیفرۆشەکان، گوڵەبەڕۆژەفرۆشەکان، عەمبەروەریدفرۆشەکان، پەشمەکفرۆشەکان وەک بڵێی هیچ یاسایەکی قەدەغەکردن نەبێت، بە درێژاییی دیوارەکە ڕیز ببوون، بەهاوارهاوار فرۆشیارییان دەکرد، کۆمەڵێک قوتابییش بە خێرایی و شڵەژانەوە سەرقاڵی شتکڕین بوون لێیان. مەولود لەپێشدا سەرسام بوو بەوەی کە بە چەندەها سەرۆکی پۆل ناتوانن قەدەغەکردنەکانی ئێسکەپەیکەر و بەڕێوبەر بگونجێنن. (بڵێی مامۆستا ئێدا چیی بوتایە بەرامبەر ئەم دۆخە؟) مەولود دوای چەندەها ڕۆژ بڕیاری دا کە ئەم

ئەستەمییە هۆکارێکی نهێنیی هەیە کە خۆیشی ناتوانێت تێی بگات. دوای چەند هەفتەیەکیش قبوڵی ئەو هۆکارە نهێنییەی کرد کە نەدەچووە ئەقڵیەوە. یەکێک لە سەرۆکە جگەرەکێشە سمێڵدارە پیرەکانی پۆل پرسیاری ژمارەکەی مەولودی کرد، بەڵام بە هەڵسوکەوتێک وەک بڵێی مەولود قوتابییەک بێت کە شت دەکرێت و یاساکان پێشێل دەکات. ئەمە بووە هۆی ئەوەی کە کابووسی بێدەسەڵاتیی مەولود زیاتر قووڵ بکاتەوە، لەبەر ئەوە مەولود لەوە ترسا لەلایەن مامۆستا ئێداوە متمانە لەدەست بدات. مەولود هەندێک جار دەیویست وەک مێشێک لە قوتابییەک بدات کە شت زۆر دەکرێت (بە جارێک سێ-چوار سمیت پێکەوە دەکرێت)، قوتابییەک کە لە خۆی بچووکتر بێت، چاویلکەلەچاو بێت، هاواری بەسەردا بکات و بیترسێنێت و ژمارەکەی لێ وەر بگرێت، بەڵام هەروەک لە خەونێکدا بێت تەنها دەمی دەکردەوە، هیچ دەنگی نەدەهات. لە زستانە بەفر و باراناوییەکەی ساڵی ١٩٧١دا، زۆربەی قوتابییەکان هیچ نەچوونە ناو باخی قوتابخانە. کاتێک مەولود لە ڕاڕەوی پشوودانەکەوە، کە سەدەها قوتابی ژاوەژاوێکی شێتکەریان تێدا دروست دەکرد، سەیری باخەکەی دەکرد، نە فرۆشیارەکانی بینی، کە بە درێژاییی دیوارەکە ڕیز دەبوون، نە بیری ئەوەی بوو کە سەرۆکی پۆلە.

لە مانگی ئاداری ١٩٧١دا کودەتای سەربازی ڕووی دا، دەمیرەلی سەرۆکوەزیرانی چەند ساڵە لە ترسی گیانی خۆی کشایەوە. ڕێکخراوە شۆڕشگێڕەکان بانقەکانیان تالان دەکرد، سیاسییەکانیان بەبارمتە دەفڕاند، دەوڵەتیش یەکلەدواییەک

باری نائاسایی و قەدەغەکردنی هاتوچۆی ڕادەگەیاند، سەرباز و پۆلیسەکان بەبەردەوامی پشکنینیان لە ماڵەکاندا دەکرد. دیواری شارەکە داپۆشرابوو بە وێنەی ئەو کەسە بەگومانانەی کە بەدوایاندا دەگەڕان، کتێبفرۆشەکانی سەر پلیکانەکان قەدەغە کرابوون. ئەمانە هەواڵێکی باش نەبوو بۆ فرۆشیاری ناو کۆڵانەکان. باوکی نەفرەتی لەو کەسانە دەکرد کە ببوونە هۆکاری ئەم تێکدانە. بەڵام دوای ئەوەشی کە بە دەیەها هەزار کەس خرانە زیندانەوە و ئەشکەنجە دران، ئەم بارە ڕاست نەبووەوە بۆ فرۆشیاری کۆڵانەکان و ئەو کەسانەی بێ ناو و ناونیشان کاریان دەکرد.

سەربازەکان هەموو قەدی چنارە گەورەکان و ئەو دیوارانەی لە سەردەمی عوسمانییەوە مابوونەوە، پلیکانەکانی ئیستانبوڵ و هەموو ئەو شوێنانەیان بە بۆیەی سپی بۆیاخ کرد کە بە نارێک و پیسیان دەزانی (لە ڕاستیدا هەموو شار بەو شێوەیە بوو)، شارەکەیان وەک سەربازگەیەک لێ کرد. پاسە بچووکەکان قەدەغەیان لێ کرا کە نەتوانن بە ئارەزووی خۆیان لەکوێدا بیانەوێت مشتەری سوار بکەن و دای ببەزێنن، (ئەمە سەرەتای کۆتاییهێنانی پاسە بچووکەکان بوو) فرۆشیارەکانیش لێیان قەدەغە کرا کە بچنە ناو گۆڕەپانە گەورەکان، جادەکان، پاپۆڕەکانی گواستەوە و باخە گەورەکان کە حەوز و فوارەیان تێدا بوو. پۆلیس لەگەڵ ڕۆژنامەوانەکاندا هەڵمەتی بەسەرددانی ڕێک خست بۆ ئەو قومارخانانەی کە بەهێزەکان بەنیوەنهێنی بەڕێوەیان دەبرد، هەروەها پشکنینی بۆ ماڵە لەشفرۆشەکان و ئەو گەنجینەی

قاچاخچییانە دەکرد کە جگەرەی ئەوروپی و مەشروبیان تێدا دەفرۆشت.

ئامادەیی ئەتاتورکی کوڕانیش کاریگەر بوو بە سیستەمی ڕادیۆ و تەلەڤزیۆنەکان، بە وشەی پابەندیی پاککردنەوەوە. ئەو وتافە سیاسییانەی کە لەسەر دیواری باخەکان و دەرگای ئاودەستەکان و کوچەوکۆلانەکاندا نووسرابوون، وتە وروژێنەرەکان و ئەو چیرۆکە ناشرین و بێئەدەبانەی کە لەبارەی مامۆستاکانەوە نووسرابوون، وێنە واتاییەکان (لە وێنەیەکدا ئێسکەپەیکەر و مەلاحەتی مەمکزل پێکەوە خەوتبوون) هەمووی بە بۆیە داپۆشران. ئەو قوتابیانەی کە ڕووبەڕووی مامۆستاکان دەبوونەوە، تێکدەرەکان و ئەو خوێندکارە ئاژاوەچییانەی کە وتافی سیاسییان دەکێشا، یاخود وانەکەیان بەرەو مناقەشەی سیاسی و پروپاگەندە دەبرد، هەموویان سەرکوت کران. بەڕێوبەر و ئێسکەپەیکەر، بۆ ڕێورەسمی ئالاهەڵکردن، بلندگۆیان خستە سەر هەریەک لە منارەکان و تەنیشت پەیکەرەکەی ئەتاتورک، بۆ ئەوەی هەموو خوێندکارەکان بتوانن پێکەوە بە یەک دەنگ مارشی ئیستیقلان بڵێن، بەلام ئەمەش جگە لە دروستبوونی دەنگێکی مەعدەنی بۆ کۆڕاڵە نەگونجاوەکە، هیچ ئەنجامێکی تری نەدا. لەسەروو ئەوەشەوە چونکە دەنگی بلندگۆکە زاڵ بوو بەسەر هەموو دەنگەکانی تردا، ئەوانەی کە مارشی ئیستیقلالیشیان دەخوێندەوە کەم ببوونەوە. لە گردەکانی پشتەوە درک دەکرا کە کەریمە کوێر لە وانەی جومناستیکدا جووڵەی زۆر قورستر بە قوتابییەکان دەکات، زۆر زیاتر هاتوهاوار دەکات.

ئیتر ڕامسیێسی مێژوووناس لە وانەی مێژووودا زیاتر باسی لە سەرکەوتنە خوێناوییەکان و ڕەنگی ئاڵاکەیانی دەکرد، کە لە خوێنەوە هاتووە و خوێنی تورکەکان جیاوازە لە خوێنی گەلانی تر. مەولود هەر لە سەرەتاوە زۆر چێژی لە وانەی مێژوو وەر دەگرت، لەبەر ئەوەی لە وانەی مێژوودا بە سەلماندن و نەخشەوە فێر ببوو کە ڕەسەنێکە لە ئاسیای ناوەڕاستەوە هاتووە، شارستانێتیی داوە بە هەموو دنیا، نەک هەزارێک بێت لە خانوویەکی بێتاپۆوە هاتبێت. هەم تێشدەگەیشت کە ئەو شتەی پێی دەوترێت زانست چەند گرنگە.

***

**مۆهینی:** ناوی ڕاستیم عەلی یالنزە. مۆهینی، ناوی ئەو فیلە جوانەیە کە پاندیت نەهروی سەرۆکی هیندیستان لە ساڵی ١٩٥٠دا بە منداڵانی تورکی بەخشیوە. لە ئامادەییەکانی ئیستانبوڵدا بۆ ئەوەی شایەنی ئەوە بیت کە لەقەبی مۆهینیت لێ بنێن، پێویستە وەک فیل گەورە و زل بیت، بەدەر لەوەش دەبێت هەژار و بەهەست بیت، هەر وەک چۆن حەزرەتی ئیبراهیم دەڵێت، "فیلەکان ئاژەڵێکی زۆر بەهەستن." ترسناکترین ئەنجامی سیاسیی کودەتای سەربازیی ساڵی ١٩٧١ لە خوێندنگەکەماندا، بڕینی قژە درێژەکانمان بوو، سەرەڕای ئەوەی زۆربەمان بەقارەمانانە بەرەنگارییەکی باشی ئیسکەپەیکەر و مامۆستاکانی ترمان کرد. ئەمە

تراژیدیایەک نەبوو بەتەنها لەنێوان منداڵانی پزیشک و کارمەندەکاندا کە مەراقی موزیکی پۆپیان هەبوو، بەڵکو بووە هۆی فرمێسکڕشتنی ئەو خوێندکارە قژجوانانەی کە لە خانووە بێتاپۆکانیشەوە هاتبوون. سەرەڕای ئەوەی لەگەڵ مەولوددا لە یەک پۆلدا بووین لە قۆناغی دووی ناوەندی، ئەم ئازارانەم بەتەنها بە هۆی قژی خۆمەوە نەچەشت، هەستم بە ئازاری هاوڕێکانیشم دەکرد. چونکە پیرترین قوتابیی پۆلەکەشم (شانزەساڵم) بۆ ئەوەی لە پشووەکاندا جگەرە بکێشم، دەچووم بۆ ئاودەستی ئامادەییەکان لە نهۆمە ژێرزەمینییەکە، بۆ ناو هاوڕێ کۆنەکانم. لەبەر ئەوەی لە هەموو پۆلێکدا ساڵێک ماومەتەوە، بیری هاوتەمەنەکانم دەکەم، کە بەتەواوەتی لێیان دوور کەوتومەتەوە. بەڕێوبەر و ئێسکەپەیکەر هەموو دووشەممانێک لە ڕێوڕەسمی ئاڵاهەڵکردندا بەردەوام هەڕەشەیان لە خوێندکارەکان دەکرد، کە هیچ پەسەند نییە کوڕەکان لەژێر کاریگەریی گۆرانیبێژە نارەسەنەکانی ئەورووپادا وەک ژن قژیان درێژ بکەنەوە، بەڵام دوای ڕووداني کودەتاکە و هاتنی سەربازەکان بۆ قوتابخانە توانرا قژبڕین پەیڕەوی بکرێت و بسەپێنرێت. بەگوێرەی هەندێکیان، ئەو سەربازە پلەدارەی کە لە جێبە سەربازییەکە دادەبەزی، بۆ ئەوە هاتبوو بۆ قوتابخانە کۆمەکیی ئەو ڕۆژهەڵاتییانە بکات کە بە کارەساتی بوومەلەرزەکە زیانیان لێ کەوتبوو، بەڵام ئێسکەپەیکەری هەلپەرست یەکسەر باشترین دەلاکی دوتتەپەی هێنا بۆ قوتابخانەکەمان. بەداخەوە منیش هەر کە سەربازەکانم بینی کەوتمە ناو ترسەوە و

قژم بڕی. کاتێک قژم بڕا، زیاتر بەناشرینی دەبینرام، زیاتر ڕقیشم لە خۆم دەبووەوە، چونکە لە ترسی سەربازەکان یەکسەر ملکەچی دەسەڵات بووم و بەپێی خۆم چووم لەسەر کورسیی دەلاکەکە دانیشتم.

***

مەولود لەگەڵ مۆهینیدا، هەموو ڕۆژێک پێش پشووە درێژەکەی کاتژمێر ١١:١٠ خولەک، لە پۆل دەچوونە دەرەوە و لە ڕاڕەو و پلیکانە شێدار و تاریکەکانەوە ڕێیان دەکرد، دادەبەزینە نهۆمە ژێرزەمینییەکە. مۆهینی لەخوارەوە لەپێشدا سەری دەدا لەو ئاودەستەی تەنیشت گەنجینەی خەڵوزەکە، کە مەولود بەترسەوە سەیری دەرگاکەی دەکرد، لە ئاودەستە بۆنپیسەکەدا کە دووکەڵی خەستی جگەرە بە تەمێکی شین دای پۆشیوە، بەسواڵکەری دەگەڕا بۆ چارەکەجگەرەیەک، ئەگەر کەسێکی بەبەزەیی بیدایەتێ، ئەوکات دای دەگیرساند و دەیکێشا، بە مەولودی دەوت، "دەرمانی تووڕەبوونەکەمم وەر گرت." دواتر لە موبەقدا لەسەرەدا دەوەستان، ئینجا مۆهینی مەنجەڵێکی گەورەی دەنایە سەر پشتی کە پێدەچێت هێندەی خۆی بێت، دەیبردە سەرەوە لەسەر زۆپای پۆلەکە بەوریاییەوە دای دەنا.

ناو مەنجەڵە زلە ناشرینەکە ئەو شیرە کوڵاوەی تێدا بوو کە لە موبەقە بۆنپیسەکەدا لە شیرە وشکەکەی **یونیسێف** دروست دەکرا، کە بێ بەرامبەر دابەشی دەکرد بەسەر قوتابخانەی وڵاتە هەژارەکاندا. لە پشوودا کاتێک مۆهینی

وەک ژنێکی وریای ماڵـەوە ئەو پەرداخە پلاستیکە ڕەنگاوڕەنگ و هەمەچەشـنانەی پڕ دەکـرد، کـە خوێنـدکارەکان لـە ماڵـەوە هێنابوویـان، مامۆسـتای چاودێریـش وەک بڵێـی خشـڵ دابـەش بـکات، بەگرنگیپێدانـەوە یەک-یـەک ئـەو حەبـە ڕۆنماسـییانەی دابـەش دەکرد بەسـەر قوتابییەکاندا، کە لـە قوتوویەکی شـیندا بـوو، دووبـارە لەلایـەن یونیسێفـەوە بێ بەرامبـەر نێردرابـوو، هەمـوو کەسـیش ڕقـی لێـی بـوو، دواتـر لەنێوان ڕەحلەکانیشـدا وەک پۆلیـس دەگـەڕا بـۆ ئـەوەی دڵنیـا بێـت کـە قوتابییـەکان ئـەم شـتە بۆنپیسـانەیان قـووت داوە. زۆربـەی قوتابییـەکان حەبەکانیـان لـە پەنجەرەکـەوە فـڕێ دەدایـە خـوارەوە بـۆ ئـەو گۆشـە زبڵاوییـەی کـە قومـاری تێـدا دەکـرا لـە باخەکـەدا، یاخـود فڕێیـان دەدایـە سـەر زەوی و پێیـان پێـدا دەنـا، تەنهـا بـۆ ئـارەزووی چێژوەرگرتنـی ئـەوەی پۆلەکـە بۆنێکـی پیسـی لـێ بێـت. هەندێکیـان بـە فووپێداکردنـی بۆریـی ئـەو قەڵەمجافانـەی کـە ناوەکەیـان بەتـاڵ کرابـوو، حەبـە ڕۆنماسـییەکانیان دەگرتـە تەختەڕەشـەکە، بـە هـۆی بۆمبارانـی بێڕێژەی ڕۆنـی ماسـییەوە، لەسـەر تەختەڕەشـەکانی ئامادەییـی ئەتاتورکـی کـوڕان لـە دوتتەپـە، لووسـییەک دروسـت ببـوو، بۆنێکـی پیسیشـی هەبـوو کـە نامۆکانـی بێـزار دەکـرد. جارێکیـان ئـەم حەبـە ڕۆنماسـییە، کـە ڕێکەوتـی پۆرترێتەکـەی ئەتاتورکـی کردبـوو لـە پۆلـی ٩-C، کـە لـە نهۆمـی سـەرەوە بـوو، ئیسـکەپەیکەر شـڵەژابوو، داوای لـە ئاساییشـی ئیسـتانبوڵ و بەڕێوبـەری پـەروەردە کردبـوو کـە موفەتیـش بنێـرن و لێکۆڵینـەوە بکـەن، بـەڵام بەڕێوبـەری بەئەزمـوون و دڵفراوانـی پـەروەردە تێگەیشـتبوو کـە هیـچ کەسـێک نیەتـی هەڵسـوکەوتێکی خراپـی نەبـووە، نـە بەرامبـەر

پێکهێنەری کۆمارییەت، نە گەورەی دەوڵەت، دواتر کۆتاییی بە کێشەکە هێنابوو.

لەو ساڵانەدا هەوڵدانی بەسیاسیکردنی ڕێورەسمی شیری وشک و ڕۆنی ماسی شکستی هێنابوو، بەڵام دوای چەندەها ساڵ هەم ئیسلامییەکان، هەم نەتەوەپەرستەکان، هەم چەپڕەوەکانیش زۆر سکاڵایان دەکرد لەوەی کە بە زەبری هێزە ئەوروپییەکان و زەبری دەوڵەت، لە منداڵییانەوە حەبی بۆنپیس و ژەهراوییان پێ قووت داون، هەتا لەبارەی ئەم بابەتەوە کتێب و یادگارییان دەنووسییەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا مەولود هیچ سکاڵایەکی نەبوو، نە لە شیر و نە لە حەبەکەی یونیسێف. بە شێوەیەک هەڵسوکەوتی دەکرد وەک بڵێی ئەوانەی نەبینیبێت کە لە پۆلدا لەسەر مێزەکانیان دادەنیشن، بێ ئەوەی شیرە بۆنپیسەکە بخۆنەوە و حەبە بۆنپیسەکە قووت بدەن، تەنها کاریان دەکرد بۆ بەڕێوەبردنی دۆخەکە، خۆیشی وەک کەسێکی ئەفەندیی بەڕێز کە دڵخۆشە بە هاتنی کاتی چای عەسر، شیرەکەی بەچێژەوە دەخواردەوە لەگەڵ ئەو پارچەنانەدا کە لەماڵەوە هێنابووی. ئەگەر مامۆستا ئێدا لە پشووەکەدا چاودێر بووایە، مەولود بەوریاییەوە هەڵسوکەوتی دەکرد. قوتابیی هاوشێوەی خۆیشی لێ بوو کە چاوەڕوانی کاتی شیرەکەی یونیسێفیان دەکرد و لە ماڵەوە پارچەنانێکی وشک، پسکیت، شەکری کڵۆیان هێنابوو، مەولود دڵخۆش بوو بەوەی کە لە پارچەنانەکەی خۆی بدات بەوان، یاخود ئاڵوگۆڕی بکات لەگەڵ ئەوانەی کە پسکیتیان هێنابوو، هەر وەک چۆن مامۆستاکەشی ئەم بارەی پەسەند دەکرد.

کاتێک لە وانەی موزیکدا هەموو پێکەوە مارشی دەیەمین ساڵیان دەوت، یاخود مارشێکی تر کە ناوەکەی نازانم، کە برگەکانی: *ئەی وەتەن ئیتر با فرمێسکەکانت بوەستن، چونکە ئێمە پێگەیشتین*، دووبارە دەکردەوە، دەکەوتە ناو هەستێکی خۆشی هەمان شێوەوە. مەولود لە وانەی ئەدەبیاتدا دڵخۆش دەبوو بە خوێندنەوەی دێڕەهۆنراوەکانی یەحیا کەمال، کە باسی لە هەست و دڵخۆشیی سەربازەکانی عوسمانیی دەکرد، کاتێک بە شمشێرەکانیانەوە باڵکانەکانیان داگیر کردووە. کاتێک لە وانە بەتاڵەکاندا هەموو پێکەوە گۆرانییان دەوت بۆ ئەوەی کات بکوژن، هەندێک جار لە ڕیزەکانی دواوەدا ئاژاوەچیترین قوتابی نوقم دەبوو لەناو پوختیەکی پەریئاسادا. کاتێک لە دەرەوە باران دەباری (بۆ ساتێک بیری لە باوکە ماستفرۆشەکەی دەکردەوە) مەولود تێدەگەیشت کە لە پۆلە گەرموگوڕەکەدا بەدەم گۆرانیوتنەوە دەتوانێت تا کۆتاییی ژیانی دابنیشێت، بیری دەکردەوە کە سەرەڕای ئەوەی دوورە لە دایک و خوشکەکانی، بەڵام ژیانی شار زۆر خۆشترە لە ژیانی لادێ.

بە چەند مانگێک دوای کودەتا سەربازییەکە، لە ئەنجامی باری نائاسایی و قەدەغەکردنی هاتوچۆ و پشکنینی ماڵەکان، بە دەیەها هەزار کەس خرانە زیندانەوە، دوای ماوەیەکی کەمیش دۆخی قەدەغەکرن نەرم بوو، وەک هەموو کاتێکی تر، فرۆشیارەکان بەئاسوودەتر دەستیان کرد بە چوونەناو کۆڵانەکانی ئیستانبوڵ، بە درێژاییی دیواری ئامادەییی ئەتاتورکی کوڕان، نۆکفرۆش و گوڵەبەڕۆژەفرۆشەکان، سمیتفرۆشەکان، عەمبەروەرید و پەشمەکفرۆشەکان دەستیان

کرد بە ڕیزبوون. مەولود کە ڕیزی لە قەدەغەکردنەکە دەگرت، لە ڕۆژێکی گەرمی بەهاردا بۆ ساتێک نزیک بووەوە لە گەنجێک کە لە تەمەنی خۆیدا بوو، هەستی کرد کە دەتوانێت زاڵ بێت بەسەریدا، ئەم گەنجەش لەو کەسانە بوو کە سەرپێچیی قەدەغەکردنەکەیان دەکرد. قوتوویەکی مقەبا بە دەستی منداڵە سیماناسراوەکەوە بوو کە بە وشەی گەورە لێی نووسرابوو:

**قیسمەت**

**بیکڕێنە و بیبەرەوە**

مەولود لە قوتووەکەدا دیاریی سەرنجڕاکێش — سەربازی پلاستیک، نوقوڵ، شانە، وێنەی یاریزانی تۆپی پێ، ئاوێنەی دەستی، هەڵمات تۆپێکی پێی پلاستیکیی گەورەی — بینیبوو.

مەولود بە شێوەیەک کە بەبڕیارەوە ببینرێت وتی، "نازانیت شتکڕین لە فرۆشیارەکان قەدەغەیە؟"

گەنجەکە وتی، "ساڵی پار پۆلی ئێمە لەتەنیشت پۆلی ئێوەوە بوو... مەولود منت بیر کەوتەوە؟"

"بیرم کەوتەوە. ئەو شتە چییە دەیفرۆشیت؟"

"هیچ شتێک نافرۆشم. بەتەنها یارمەتیی ئەو کەسانە دەدەم کە دەیانەوێت شانسی خۆیان ببینن. دەزانیت، خوا هەندێک مرۆڤی زیاتر خۆش دەوێت لە هەندێکی تر. لە کۆتاییدا ئەوان دەوڵەمەند دەبن. هەندێکیشیانی کەمتر خۆش دەوێت. ئەوانیش بەهەژاری دەمیننەوە. زانیارییەکی گرنگە کە بزانیت کێی خۆش دەوێت، کێی خۆش ناوێت. یەکێک لەم کونە ڕەنگاوییانە بە دەرزیی سەرخڕ دەکرێنیت، لەژێریدا دەر

دەکەوێت کە دیارییەکەت چییە، شانسداریت یاخود بێشانس."

مەولود پرسیی، "ئەم یارییە تۆ دات هێناوە؟ دیارییەکان لە کێ دەکڕیت؟"

"هەموو یارییەکە بەکۆمەڵ، بە دیارییەکانیەوە بە ئامادەییی دەفرۆشن. هەمووشی دەکڕیت بە سیودوو لیرە. ئەگەر لە کۆڵانەکانیشدا بگەڕێیت سەد کون بە مشتەرییەکانت بفرۆشیت و پێیان هەڵبکرێنیت کە یەکی بە شەست قرووشە، ئەوا شەست لیرەت دەست دەکەوێت. لە کۆتاییی هەفتەدا لە باخەکاندا پارەی باشت دەست دەکەوێت. تاقیی دەکەیتەوە، ئایا دەبیت بە کەسێکی دەوڵەمەند، یاخود دەبیت بە کەسێکی هەژار، بەگەمژەیی دەبینرێیت؟ یەک دانە هەڵبکرێنە، وەڵامەکەی بخوێنەرەوە. بۆ تۆ بەخۆڕایی."

"دەیبینیت کە من هەژار نابم. بە چەندە؟"

"بۆ تۆ بەبەلاش."

مەولود بێ ئەوەی هەست بە دوودڵی بکات، دەستی درێژ کرد و بەهونەرەوە دەرزییە سەرخڕەکەی لە فرۆشیارە منداڵەکە وەر گرت. لە مقەباکەدا زۆر کونی تێدا بوو کە نەکرێنرابوون. بەئاگاوە کونێکی هەڵبژارد و کڕاندی.

منداڵە فرۆشیارەکە وتی، "بێشانسی، بۆش دەر چوو."

مەولود بەتووڕەییەوە وتی، "ئادەی ئەوەم بدەرێ بزانم." لەژێر ئەلەمنیۆمە کرێنراوە ڕەنگاوڕەنگەکەدا نە وشەیەک هەبوو نە دیارییەکیش. "ئێستا چی دەبێت، چی بکەین؟"

منداڵە فرۆشیارەکە وتی، "ئەگەر بۆش دەر بچێت، ئەمە دەدەین." پارچەیەک چۆکۆلاتەی گۆفرێتی دا بە مەولود، کە هێندەی قاوغەشقارتەیەک گەورە بوو. "بەڵێ شانست

لەوێ نەبوو، بەڵام ئەوەی لە قوماردا بیدۆڕێنێت لە عەشقدا دەیباتەوە. هیچ کات لە ژیاندا ڕەشبین مەبە. مەسەلەکە ئەوەیە کاتێک دەیدۆڕێنیت، بیبەیتەوە. تێگەیشتیت؟ تەنانەت هەر لە ئێستاوە هەندێک هەواڵی باش هەیە بۆ تۆ."

مەولود بە بیرکردنەوە لە مامۆستا ئێدا وتی، "هەواڵی وەک چی؟" گۆفرێتەکەی خستبووە دەمیەوە، لەو کاتەدا کە شتە ناخۆشە تام کایەکەی دەجوو، دەمی وەستا.

فرۆشیارەکە وتی، "هێشتا سیانزە ساڵانی، بەڵام هەر لە ئێستاوە فێری بەرتیلوەرگرتن بوویت."

مەولود بەتووڕەییەوە وتی، "خەمت نەبێت پارەکەت دەدەمێ،" دەستی برد بۆ گیرفانی. "تۆ ناوت چییە، ژمارەکەت چەندە؟"

"٣٧٥ فەرهاد یڵماز. شکاتم لێ دەکەیت لای ئێسکەپەیکەر؟"

مەولود بە شێوەیەک جووڵەیەکی بە دەستی کرد، بە واتای (چۆن شتی وا دەبێت؟) فەرهادیش دەربڕینێکی وەک (چۆن شتی وا دەبێت؟) خستە سەر سیمای، چونکە یەکسەر تێگەیشتن کە دەبن بە دوو هاوڕێی باش.

مەولود لە یەکەم ساتەکاندا شەیدای ئەوە بوو کە فەرهاد سەرەڕای ئەوەی لە تەمەنی خۆیدایەتی، زمانی کۆڵانەکان، شوێنی دوکانەکانی ناو شار و نهێنیی مرۆڤەکان دەزانێت. جگە لەوەش کاریگەر بوو بە تێڕوانینە سیاسییە توند و ڕەهاکانی فەرهاد. فەرهاد پێی وت کە قوتابخانە هێلانەی هاوبەشی ساختەچی و فێڵبازەکانە، ڕامسێسی گەمژەی مێژووناس، یاخود زۆرینەی مامۆستاکان ئەمەندە کەسانێکی بێکەڵکن، جگە لەوەی کە دەیانەوێت بەبێ گێرەوکێشە (واتە

پێش ئەوەی لەلایەن قوتابییە بەهێزەکانەوە لێدان بخۆن) لەوانەکاندا بێنە دەرەوە و مووچەکەیان وەر بگرن، بیر لە هیچ شتێکی تر ناکەنەوە. مەولود حەقیشی دەدا بە تێڕوانینەکانی فەرهاد بەرامبەر ئەو سیستمەی لە قوتابخانە پێک هێنراوە، کە بەتەنها ڕەنگدانەوەی سیستمە بێکەڵکە چەوسێنەرەکەی تورکیایە، (فەرهاد ئەم قسە جوانانەی لەکوێ دەدۆزییەوە؟) بەڵام زۆری پێ نەچوو فەرهاد ڕووی زمانە درێژەکەی کردە مەولود. پاسەوانیکردنی سیستم، سەرۆکایەتیکردنی پۆل، لەناو ئەو سیستمەی کە ئێسکەپەیکەر پێکی هێناوە بۆ ئەوەی قوتابییە هەژارەکان بشێلێت، هیچ گونجاو نییە بۆ کەسێکی بەڕێز و نەفسبەرز. فەرهاد یەک جار هەستێکی وەهای دابوو بە مەولود کە شەرم دەکات لەگەڵ کەسێکی وەهادا هاوڕێیەتی بکات و لە کۆڵانەکاندا قیسمەت یاخود هەر شتێکی تر بفرۆشێت.

مەولود وتبووی، "هەتیو ئەگەر هاوڕێیەتیم ناکەیت، مەیکە!" بۆ ماوەی هەفتەیەک جگە لە چاوەکانی مامۆستا ئێدا، سەیری هیچ شتێکی تری نەکردبوو، لە قوتابخانەدا لەگەڵ هیچ کەسێکدا قسەی نەکردبوو، هەتا لەگەڵ فەرهادیشدا. جارێکی تریش بێزار ببوو لە قسەتێچەقاندنەکانی فەرهاد، "تۆ قوربانیت، یاخود جەللادی؟" هیچ گوێی نەدابووە وانەکان و تاقیکردنەوەکان، بۆ ماوەی هەفتەیەک هەموو دوانیوەڕۆیەک، هەموو شەوێک لەگەڵ باوکیدا چووبوو بۆ ماستفرۆشتن لە کۆڵانەکاندا. لە مانگی ئاداریشدا دووبارە چەند ڕۆژێک نەچووبووەوە بۆ قوتابخانە.

ڕۆژێکی سارد پەیکەری ئێسقان بەو سوپا بچووکەی کە پێشتر پێکی هێنابوو لە فەڕاش و خزمەتکار و

ئەوانەی لە موبەقەکەدا شیری وشکیان دەکوڵاند، لە باخی خەڵووزدانەکەدا بەوریاییەوە پەلاماردانێکی ڕێک خست بۆ ئەو فرۆشیارانەی کە بە درێژاییی دیواری قوتابخانە ڕیز ببوون. مێزی سمیتفرۆشێک کەوتە سەر زەوی، سمیت و چۆرەکەکانی کەوتنە ناو قوڕەکەوە، فرۆشیارێکی نۆک-گوڵەبەڕۆژە لەگەڵ عەبدولوەهابدا، کە چاودێری گەنجینەی خەڵووزەکە بوو، دەستیان کرد بە مستەکۆڵەدان بەیەکدا. کاتێک ئیسکەپەیکەر هەڕەشەی ئەوەی دەکرد تەلەفۆن دەکات بۆ پۆلیس و سەربازە پلەبەرزەکانی دۆخی نائاسایی، مەولود حەقی دا بە تاوانبارکردنەکانی فەرهاد.

مەولود بە هەستی تاوانبارییەوە وتی، "لە ڕاستیدا من هیچ چاوم لەوە نییە کە سەرۆکی پۆل بم!"

فەرهاد وتی، "یەکسەر لە پۆلدا پەنجەت هەڵبڕە، دەست لە کاری سەرۆکایەتیی پۆل بکێشەرەوە."

"زۆر شوورەیی دەبێت بەرامبەر مامۆستا ئێدا، چونکە ئەو منی کردووە بە سەرۆکی پۆل."

"بۆچی؟ دایکتە، یاخود تۆ عاشقی ئەویت؟"

فەرهاد بێ ئەوەی هیچ بیر لە وشەی عەشق بکاتەوە، بەکاری هێنابوو، بەڵام مەولود لەو ساتەدا بڕیاری دا کە لە ڕاستیدا دەتوانێت بەم وشەیە ئاماژە بەو هەستە بدات کە ماوەی ساڵێکە مێشکی تێکەڵ کردووە. بەشانازییەوە وتی، "بەڵێ، من عاشقی مامۆستا ئێدام."

ئەم دانپێدانانە لەنێوانیاندا بووە هۆی کۆمەڵێک سوعبەتکرن و شەڕ و پەیوەستبوون بەیەکەوە. مەولود بیری لەوە دەکردەوە کە فەرهاد لە سەردەمە هەرە خراپەکانیدا ئەم نهێنییە بۆ

کەسـانی تـر بـاس دەکات، بەدڵنیایـی بەگاڵتەپێکردنـەوە باسـی دەکات، بـە هـۆی سـوعبەتەکانی فەرهـادەوە سـەرەداوەکانی ئـەم خیانەتـەی دۆزییـەوە. فەرهـاد لـە کاتـی هـەرە گاڵتجاڕیـدا دەیـوت، "بەگوێرەی ئـەوەی بـە ناسـین هاوسـەرگیری دەکـەن، یەکسـەر بـە داخـوازی هاوسـەرگیری ناکـەن، ئـەم هاسـەرگیرییە هاوچەرخانـە دەبێـت!" یاخـود، "منیـش بـاوەڕم بـەوە هەیـە کـە لـە عەشـقدا جیاوازیـی تەمـەن گرنـگ نییـە." مەولـود بـەم سـوعبەتانە نائاسـوودە دەبـوو، ئەگـەر فەرهـاد زیادەڕۆییـی بکردایـە، لـەدواوە قوڵـی بـا دەدا و بێدەنگـی دەکـرد، چونکـە لـە فەرهـاد کەتـە و باڵابەرزتـر بـوو.

بـە درێژاییـی سـاڵێکی دوای ئـەم یەکترناسـینەیان، هەمـوو جارێـک کـە یەکتریيـان دەبینـی، فەرهـاد سـوعبەتی لەبـارەی عەشـقەکەی مەولـودەوە دەکـرد، ئەمـەش وەک جگەرەپێشکەشـکردن، یاخـود باسـکردن لـە بەرنامـە تەلەڤزیۆنییەکـەی شـەو، بـوو بـە ڕێوڕەسـمێک بـۆ ئـەوەی هاوڕێیەتـی و دۆسـتایەتییەکەیان پێکـەوە چڕتـر ببێـت. مەولـود بـە هەفتەیـەک دوای دانپێدانانەکـەی، ڕوونـی کردبـووەوە وتبـووی، "بـۆ سـوعبەت ئـەو قسـانەم کردبـوو."

بەڵام بـەردەوام بیری لە مامۆستا ئێدا دەکردەوە، بۆ ئەوەی لەبـارەی ئەویشـەوە قسـە بـکات، جگـە لـە فەرهـاد متمانـەی بـە کەسـی تـر نەبـوو. کاتێـک لـە پشـووی هاویـندا گەڕایـەوە بـۆ لادێ، بەچێژەوە ژیانـی عەشـقەکەی ئیسـتانبوڵی گێڕایـەوە بـۆ شـوانێکی لادێـی گوموشـدەرە: کاتێـک ماستفرۆشـیی کـردووە لەگەڵ ژنێکی گەنجدا ئەزموونـی عەشقی کردووە کە مەولودی بـەدڵ بـووە. ژنەکـە قـژی قاوەیـی بـووە، هـەر وەک مامۆسـتا

ئێدا قژی تۆپەڵ کردووە وەک هێلانەی باڵندە، پێستێکی مات و چاوەکانی سەوز، زۆر کەسێکی بەڕێز و دیمەنێکی ناسکی هەبووە. بەڵام بەدڵنیاییی مەولود لە داهاتوودا لەگەڵ ژنێکدا هاوسەرگیری دەکرد کە لە تەمەنی خۆیدا بێت و دەستی بەر دەستی کوڕی تر نەکەوتبێت.

مامۆستا ئێدا لە پۆلی سێی ناوەندیدا دووبارە مامۆستای وانەی ئینگلیزی هەردووکیان بوو. مەولود لە دۆخێکی لاوازیدا بە فەرهادی وت و دانی پێدا نا کە بەردەوام بە سەیرکردنی چاوەکانی مامۆستا ئێداوە لە ڕیزی پێشەوە دادەنیشت، ئازارێکی سەیر دەچێژێت. تاکو ئێستاش کاتێک لە ڕاڕەوی پشوودانەکەدا ڕێکەوتی ئەو دەکات، دڵی دەکەوێتە پەلەپەل، بەداخەوە کە هەموو کات بیر لەو دەکاتەوە.

فەرهاد ئەم جارەیان بابەتەکەی لە ڕووی سیاسییەوە شیی کردەوە. دەبووایە هەموو قوتابییەک عاشقی یەکێک بووایە لە پۆلەکەی خۆی. بەتەنها لە فیلمی تورکیدا ڕووی دەدا، کەسێکی هەژار عەشقی دەوڵەمەندێک ببێت، بەتایبەتی هاوسەرگیریکردنیان. بە ئەڵقەکەی دەستیشیدا دیار بوو کە مامۆستا ئێدا هاوسەرگیریی کردبوو. مێردەکەی دکتۆرێکی بەناوبانگی ژنان بوو، کە جارجارێک شیعریشی دەنووسی و شیعرەکانیشی (مەولود بۆ ساتێک ویستی ببێت بە شاعیر) بڵاو دەکرایەوە. هەموو کەس دەیزانی کە بە هۆی لەباربردنی کۆرپەوە بە شێوەیەکی نهێنی، پارەی زۆر پەیدا دەکات. بەدەر لەوەش، مامۆستا ئێدا لە ئامادەییە تایبەتەکاندا وانەی تایبەتیی دەوتەوە، زۆر بەباشی هەڵسوکەوتی لەگەڵ منداڵەکانی ئەوێدا دەکرد، ئەو قوتابییانەی هەرگیز نزم

نەدەکردەوە کە نەدەچوونە وانەکەیەوە وەک لە قوتابخانەکەی ئێمەدا دەیکرد و تەنها بۆ ئەوەی ببێت بە فەرمانبەر وانەی تێیدا دەوتەوە. چاوەکانی مەولود گەشابوونەوە کاتێک ئەرکی سەرۆکی پۆلی پێ بەخشیبوو، بەڵام ئایا مەولود دەیزانی کە مامۆستا ئێدا ژمارەی هەموو ئەو قوتابییانەی کۆدەکردەوە کە هارییان دەکرد و نەدەچوونە وانەکەیەوە و پرسیاری سیاسییان دەکرد، دواتریش دەیدا بە ئێسکەپەیکەر؟ جگە لەوەش فەرهاد ئەوەی بە ڕاست نەدەزانی، کاتێک مامۆستا ئێدا زمانی ئینگلیزی فێری قوتابییە هەژارەکان دەکرد، وەک بڵێی خۆی بە ئینگلیزێک دەزانی، گاڵتەی بەو قوتابییە لادێییانە دەکرد کە نەشارەزا بوون، نەیاندەتوانی بەباشی وشە ئینگلیزییەکە بە شێوازی ئاسایی بڵێن.

فەرهاد کە زۆر لە هەوڵی ئەوەدا بوو کۆتا وانە بدات بە مەولود، بیهێنێتە سەر ڕێگەی ڕاست، لە نیسانی ساڵی ١٩٧٢دا سەرەڕای ئەوەی هێشتا لە قۆناغی ناوەندی بوون، توانیی کە مۆڵەت لە مامۆستا ئێدا وەر بگرێت بۆ ئەوەی بچنە ناو کتێبخانەکەوە. بەیانییەکی خۆرهەتاوی پرشنگداری بەهار لە دەوروبەری تاکە درەختەکەی باخەکەدا چۆلەکەی بەنەشئە و بێسەبری لێ بوو، مەولود و فەرهاد نەچوونە وانەی مێژووەوە، لە ڕاڕەوە تاریک و ساردەکانەوە کە گەرمای بەهار هیچ کاری تێ نەکردبوون، وەک سێبەرێک بەدزییەوە تێپەڕ بوون. گوێبیستی پۆلی دووی (بی)ی بەشی بیرکاریی قۆناغی ئامادەیی بوون، هەموویان پێکەوە گۆرانیی *لووتکەی شاخ دووکەڵ دای پۆشیوە*یان دەوت، لە پۆلی یەکی (دی) ی قۆناغی ئامادەییدا دەنگە تیژەکەی مەلاحەتە زلە هەموو

قوتابییەکانی بێدەنگ کردووە، پۆلی سێیی (بی)ی ئەدەبیات مامۆستاکەیان نەهاتووە، نیوەی پۆلەکە سەتڵە پلاستیکییە شێوەحەسیرەکەی خۆڵەکەیان کردووە بە سەبەتەی باسکە و تۆپێکی باسکەشیان دروست کردووە یاری دەکەن، نیوەکەی تریشی لایەنگری دەکەن و هاوار دەکەن. (مەولود دوای چەندەها ساڵ کاتێک یادی ئەو کاتژمێرانەی دەکەوتەوە کە زۆر گرنگ بوون، تێدەگەیشت کە لە ڕاستیدا لەو ڕاڕەوانەدا هەستی کردبوو ناتوانێت قۆناغی ئامادەیی تا کۆتایی تەواو بکات).

مامۆستا ئێدا ڕێی پێ دان بێنە کتێبخانە بچووکەکەوە کە بۆنی کاغەزی کۆن و تۆزی لێ دەهات، لە کەنارەکەدا، لەسەر مێزێک هەردووکیانی لەتەنیشت یەکەوە دانیشاند و کتێبێکی خستە بەردەمیان کە نەیدەدا بە هیچ کەسێک، بەتەنها قوتابییە زۆر تایبەت و بەهرەدارەکان نەبێت. *Arund the World in Eghty Days*، کە کتێبی بای ژولێس ڤێرنە بوو. ئەم کتێبە یەکێک بوو لە بڵاوکراوەکانی لۆگمان، کە کورت کرابووەوە، ئاسان کرابوو بەتەنها بۆ ئەو کەسانەی کە هەزار وشەی ئینگلیزی دەزانن.

مامۆستا ئێدا وتی، "ئەگەر ڕێکەوتی وشەیەکتان کرد کە واتاکەی نازانن، لە کاغەزێکدا بینووسن، دواتر ئەگەر ویستتان فەرهەنگەکەتان دەدەمێ، چونکە قەدەغەیە لە هەمان کاتدا هەم سەیری کتێبەکە هەم سەیری فەرهەنگەکە بکەن. کاتێک وانەتان نییە، دەتوانن پێکەوە بێن بیخوێننەوە!" بۆ ساتێک بە چاوە سەوزەکانیەوە سەیری ناو چاوەکانی مەولودی کرد کە ترس و شەیدابییان تێدا بەدی دەکرا. دوای کەمێکی تر

ئەو دوو هاوڕێیەی بیر چووەوە کە لە ژیانیاندا بۆ یەکەم جار کتێبی ئینگلیزییان دەخوێندەوە.

کتێبخانەکە کەمێک لە پۆلی خوێندن بچووکتر بوو. بەرامبەر ئەو مێزەی کە مەولود و فەرهاد لەسەری دانیشتبوون و ژولێس ڤێرنەیان دەخوێندەوە بێ ئەوەی هیچ تێبگەن، مێزێکی خواردنگەی پەنجاکەسیی زۆر درێژی لێ بوو، کە قوتابییانی پۆلێک بەگشتی دەیانتوانی بەدەوریدا دابنیشن. لە ڕەفەکاندا چین چین کۆکراوەی ئانسایکلۆپێدیا و کتێبی تۆزاوی و گۆڤار ڕیز کرابوون، کە بێوەژنەکانی گەڕەکەکەی سەرەوە دوای مردنی مێردە فەرمانبەرە خانەنشینەکانیان بەخشیبوویان بە کتێبخانەکە. مامۆستا ئێدا کتێبە باش و بەهادارەکانی نەدەدا بە قوتابییەکان، بۆ ئەوەی پیس نەبن. گۆڤارە کۆنە وێنەدارەکان گونجاوتر بوون بۆ ئەوەی خوێندنەوە لای قوتابی خۆشەویست بکەن. جگە لەوە هیچ گرنگیش نەبوو کە پیس ببن و بدڕێن. مەولود و فەرهاد کاتێک هەوڵیان دەدا بێ ئەوەی سەیری فەرهەنگەکە بکەن بزانن کە فایلێس فۆگ چی کردووە، بەگرمەگرم دەرگاکە کرایەوە و قەرەباڵغییەک هاتە ژوورەوە. ئەمانە قوتابییەکانی پۆلی سێی بیی ئەدەبیات بوون، کە وانەکەیان بەتاڵ بوو. ئەم قوتابییانەی کە کەمێک پێش ئێستا لە پۆلەکەیاندا یاریی باسکەیان دەکرد، ژاوەژاوێکی زۆریان دروست کردبوو، بە کاریگەریی سەرزەنشتەکانی ئێسکەپەیکەر، بە بێدەنگییەکی سەرسووڕهێنەرەوە لەسەر کورسییەکانی دەوری مێزەکە دانیشتن. مەولود جارێکی تریش شەیدای مامۆستا ئێدا بوو، لەبەر ئەوەی کاتێک قوتابییە هارەکانی ئامادەییەکە

ئەویان دەبینی، وەک مۆمیان لێ دەهات. مامۆستا ئێدا چەند گۆڤارێکی کۆنی بیست-سی ساڵەی وەک: *ئەتاتورکی جوان، ئارکیۆلۆجی و هونەر، ڕۆح و مادە، تورکیاکەی ئێمە، دنیای پزیشکی، گەنجینەی زانست.* کە پەڕەکانیان زەرد ببوو، بەوریاییەوە دابەش کرد بەسەر قوتابییەکاندا، بە شێوەیەک کە بە دوو قوتابی یەک گۆڤاریان بەر دەکەوت، هەر وەک چۆن دابەشی دەکرد بەسەر ئەو پۆلانەی لە پشووەکاندا دەهاتن بۆ کتێبخانەکە. کاتێک مامۆستا ئێدا دڵنیا بوو کە بە دوو قوتابی یەک گۆڤاریان بەر کەوتووە، ئەوکات دەستی کرد بەو قسەکردنە پوخت و ناودارەی لەبارەی چۆنێتیی خوێندنەوەوە بوو، کە مەولود زۆر ئارەزووی لێ بوو، بەجیددی گوێی لێ دەگرت.

یەکەم ڕستەی ناوداری ئەم قسەکردنە کە گاڵتەجاڕەکان دواتر بەردەوام لاساییان دەکردەوە، ئەمە بوو، "کاتێک کتێب دەخوێنیتەوە بە هیچ شێوەیەک نابێت قسە بکەیت." دواتر بەردەوام دەبوو، "دەبێت بەبێدەنگی لە ناختاندا ئەو شتە بخوێننەوە کە دەتانەوێت بیخوێننەوە. ئەگەر بەو شێوەیە نەخوێننەوە، ئەوکات ناتوانن سوود لە زانیارییەکان وەر بگرن. بەسەبرەوە، بە دڵ بیخوێننەوە، دەخیلتان بم سەرتان لەسەر گۆڤارەکە بەرز مەکەنەوە، لە ناختانەوە گوێ لە دەنگی گۆڤارەکە بگرن. بیر لە هیچ شتێکی تر مەکەنەوە. کاتێک دەگەنە کۆتاییی ئەو پەڕەیەی کە دەیخوێننەوە، یەکسەر پەڕەکە هەڵمەدەنەوە، چاوەڕوان بن تا دڵنیا دەبن کە هاوڕێکەشتان خوێندنەوەی ئەو پەڕەیەی تەواو کردووە. دواتر بێ ئەوەی پەنجەتان بە زمان تەڕ بکەن پەڕەکە هەڵبدەنەوە. لەسەر پەڕەکان شت مەنووسن.

ڕەشی مەکەنەوە. بەتایبەتی دەخیلتان بم لەسەر وێنەکان سمێڵ و ڕیش و چاویلکە مەکێشن. نابێت بەتەنها سەیری وێنەکانی ناو گۆڤارێک بکرێت، دەبێت نووسینەکانی ناویشی بخوێنرێتەوە. لە هەموو پەڕەیەکدا لەپێشدا نووسینەکان بخوێننەوە، دواتر سەیری وێنەکان بکەن. کاتێک گۆڤارەکەتان لە سەرەتاوە تا کۆتایی خوێندەوە و تەواوتان کرد، بەبێدەنگی دەست هەڵبڕن، من دەیبینم، دێم، گۆڤارەکەتان بۆ دەگۆڕم. بەڵام کاتی ئەوەتان نییە کە هەموو گۆڤارەکە بخوێننەوە.“ مامۆستا ئێدا بۆ ساتێک بێدەنگ بوو، ویستی کاریگەریی قسەکانی لە سیمای قوتابییەکانی پۆلی سێی (بی)ی ئەدەبیاتدا ببینێت کە مێشکیان تێکەڵ بووە، دواتر دەستی کرد بە گیرفانی سەدرییەکەیدا، کە خۆی درووبووی، وەک پاشایەک کە فەرمانی کۆتا جەنگ و تالانکردن دەدات بە سەربازە بێسەبرەکانی، کۆتا ڕستەی وت، ”ئێستا دەتوانن دەست بکەن بە خوێندنەوە.“

منگەمنگ و ژاوەژاوێک دروست بوو، بەشڵەژاوی و بەمەراقەوە خشەخشی هەڵدانەوەی پەڕە زەردەکان بیسترا. دواتر بێدەنگییەک دەستی پێ کرد.

فەرهاد چرپاندی و وتی، ”دەیبینیت، ڕێک فاشیستە!“

مەولود بێ ئەوەی سەری لەسەر ئینگلیزییەکەی ژولیس ڤێرنە بەرز بکاتەوە کە ڕوون نەبوو، چرپاندی و وتی، ”نەخێر، نەخێر، ژنێکی زۆر باشە!“

” تۆ ئەوت لەبەر ئەوە خۆش دەوێت کە ئەوەندە تووڕە و ڕەقە؟“

مەولود وتی، ”تۆ چۆن دەتوانیت ئەم هەموو قوتابییە هار و ناڕێکوپێکە سەرکوت بکەیت؟“

فەرهاد وتی، "من هیچ کەسێک سەرکوت ناکەم."
هەستێکی تووڕەیی لە سیمایدا دەر کەوت، کە مەولود پێشتر قەت نەیبینیبوو لەودا، لەو ساتەدا فەرهاد پەنجەی هەڵبڕی.
مەولود وتی، "ئەوە چی دەکەیت؟ پەنجەت دابگرە. دەیبینێت."
"منیش بۆ ئەوەی ببینێت پەنجەم بەرز دەکەمەوە."
مەولود قۆڵی فەرهادی گرت و ویستی پەنجە بەرزبووەکەی دابگرێت، فەرهاد بەرهەڵستیی دەکرد، لەو کاتەدا مامۆستا ئێدا بینیی کە هەردووکیان لە کتێبخانەکەدا یەکتر ڕادەکێشن و پاڵ بەیەکەوە دەنێن. مەولود تێگەیشت ئەو دەربڕینە ناڕازییەی سیمای مامۆستا ئێدای تاکو کۆتاییی ژیانی بیر ناچێتەوە.
مامۆستا ئێدا بە شێوەدەنگێک کە بەرامبەر قوتابییە هار و بێتەربێت و بێڕێزەکان بەکاری دەهێنا وتی، "چی ڕووی داوە؟"
فەرهاد هاواری کرد و وتی، "مامۆستا دەمەوێت پرسیاری شتێک بکەم."
مەولود بەنائومێدییەوە بەچرپە دەیوت، "نەخێر،" وەک ئەوەی لەناو خەودا بێت.
فەرهاد وتی، "مامۆستا، ڕێژەیەکی زۆر گۆڤار و کتێب لەسەر ڕەفەکانە! بۆچی لەجیاتیی هەر قوتابییەک گۆڤارێک، بە دوو قوتابی گۆڤارێکیان دەدەیتێ؟"
دەربڕینێک لە سیمای مامۆستا ئێدا دەر کەوت کە دیار بوو بە هۆی ئەم پرسیارە ناقۆڵایەوە چەند خەمبار بووە و تووشی نائومێدی بووە. مەولود ویستی لایەنی ئەو بگرێت.

بەڵام درکی بەوە کردبوو کە خیانەتکردن لە هاوڕێیەتی، گوناحێکی زۆر گەورەترە لەوەی لە قورئاندا نووسراوە.

مامۆستا ئێدا وتی، "تکاتان لێ دەکەم کاتی خوێندنەوە مەشێوێنن، ئێرە پۆل نییە! بواری قسەم نەدابوو بە تۆ. بەڕاستیش کتێبخانە بەگوێرەی قوتابییانی ناوەندی نییە. ئێوە ژمارەکانتان چەندە؟"

هەموو قوتابییانی سێی ئامادەیی پۆلی (بی)ی ئەدەبیات بەراوردنەوە سەیری دوو قوتابییە ناوەندییەکەیان دەکرد.

"٣٧٥"

"١٠١٩"

مەولود وای زانیبوو درک بەوە دەکرێت کە خەریکە بگری، بەڵام دەنگی بەباشی دەر چوو.

مامۆستا ئێدا وتی، "دواتر لەگەڵ ئێوەدا یەکتر دەبینین، ئێستا یەکسەر بگەڕێنەوە بۆ پۆلەکەی خۆتان."

لە دەرگاکەوە چوونە دەرەوە. کاتێک لە ڕاڕەوە تاریکەکانەوە بەبێدەنگی دەگەڕانەوە بۆ پۆلەکەیان، مەولود هەستی کرد کە ئیتر نایەوێت بژی.

فەرهاد وتی، "هیچ گوێی مەدەرێ، لەگەڵ کەسێکی تردا هاوسەرگیریت پێ دەکەین. ئەو تۆی خۆش نەدەویست."

لە تاریکترین گۆشەی ڕاڕەوەکەدا بوون. مەولود مستەکۆڵەیەکی توندی دا بە شانی فەرهاددا. ئیتر ئەو ڕۆژە هیچ قسەیان لەگەڵ یەکتردا نەکرد.

مەولود بۆ ماوەی دوو هەفتە نەچوو بۆ قوتابخانە. مۆهینی ناوی بە غایب نەدەنووسی، بۆ ئەوەی غیاباتی نەگاتە سی ڕۆژ و بە هۆی نەچوونیەوە بۆ قوتابخانە لە

پۆله‌که‌یدا ده‌ری نه‌که‌ن، ئه‌گه‌ر ناوی له‌ناو لیسته‌ی ئه‌و قوتابییانه‌دا بنووسێت که‌ ده‌فته‌ری پۆلیان نییه‌، ئه‌وكات ناوه‌که‌ی ده‌کوژایه‌وه‌. مه‌ولود بۆ ماوه‌ی دوو هه‌فته‌ له‌گه‌ڵ باوكیدا له‌ كۆڵانه‌كاندا ماست و بۆزای فرۆشت. كاتێک له‌ سه‌ره‌تای مانگی نیساندا وه‌رزی فرۆشتنی بۆزا كۆتایی هات، ده‌ستی كرده‌وه‌ به‌ خوێندن. یه‌كه‌م ڕۆژ به‌ شێوه‌یه‌كی خۆڕسک له‌ ڕیزه‌كانی دواوه‌دا له‌ شوێنێكدا دانیشت. قوتابیی ڕیزه‌كانی دواوه‌ به‌ شێوه‌یه‌ک هه‌ڵسوكه‌وتیان له‌گه‌ڵدا كرد وه‌ک بڵێی هیچ شتێک نه‌بووبێت، هه‌ر وه‌ک چۆن به‌رامبه‌ر ئه‌و هاوڕێیانه‌ی پۆله‌كه‌یان ده‌یانكرد كه‌ باوكیان مردووه‌ و له‌ لادێوه‌ گه‌ڕاونه‌ته‌وه‌، یاخود له‌ شوێنێک ئیش ده‌كه‌ن و دواتر ڕۆژێک به‌ شێوه‌یه‌كی چاوه‌ڕواننه‌كراو ده‌گه‌ڕێنه‌وه‌ بۆ پۆله‌كه‌یان. مه‌ولود یه‌كسه‌ر زانیی كه‌ ڕامسێس له‌ وانه‌یه‌كی پڕژاوه‌ژاودا زانیویه‌تی كه‌ سه‌رۆكی پۆل ده‌ ڕۆژه‌ نه‌خۆشه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ له‌ جێگه‌یدا زاوای هه‌ڵبژاردووه‌ به‌ سه‌رۆكی پۆل. كه‌واته‌ مامۆستا ئێدا هیچ به‌رهه‌ڵستییه‌كی له‌م بڕیاره‌ نه‌كردبوو، له‌ كاتێكدا خۆی ساڵی ڕابردوو مه‌ولودی هه‌ڵبژاردبوو. مه‌ولود هه‌ستی كرد خیانه‌تی لێ كراوه‌، له‌ وانه‌ی مامۆستا ئێدادا په‌نجه‌ی به‌رز كرده‌وه‌.

وتی، "ئێوه‌ منتان هه‌ڵبژارد بۆ سه‌رۆكی پۆل، به‌ڵام من وه‌ک ناڕه‌زاییده‌ربڕینێک به‌رامبه‌ر ئه‌وه‌ی كه‌ قه‌ده‌غه‌یه‌ قوتابییانی قۆناغی ناوه‌ندی بچنه‌ كتێبخانه‌كه‌، ده‌ستم له‌ سه‌رۆكایه‌تی كێشایه‌وه‌!" پلانی بۆ ئه‌مه‌ نه‌كێشابوو. نه‌یده‌توانی له‌ وانه‌كه‌ تێبگات، مێشكی له‌نێوان تووڕه‌یی و گاڵته‌پێكردن و خه‌یاڵدا ده‌هات و ده‌ڕۆیشت.

مامۆستا ئێدا لەپێشدا ئاسوودە بوو کە یەکێک لە ڕیزەکانی دواوە پەیوەستە بە وانەکەوە، پەنجەی هەڵبڕیوە. بەلام کە تێگەیشت بابەتەکە جیاوازە، نائاسوودە بوو.

"تۆ ژمارەکەت چەندە؟ ئەگەر دەتەوێت، لە ڕیزی پێشەوە لە شوێنێکدا دابنیشە!"

مەولود وتی، "نەخێر، من لە ڕیزەکانی دواوەدا دادەنیشم."

لە ڕیزەکانی دواوەدا یەک-دوو گاڵتەپێکەر لەگەڵ قوتابییەکدا کە بەتەواوەتی پیر ببوو، هەر لە ئێستەوە ژیانی لەدەست چووبوو، یەک-دوو جار چەپڵەیان لێدا، بەلام یاخیبوونەکەی مەولود بێ ئەوەی هیچ نیشانەیەک جێ بهێڵێت زوو لەبیر چووەوە.

کاتێک جەرەس لێی دا، پێش ئەوەی مامۆستا ئێدا لە دەرگاکە بچێتە دەرەوە مەولود ڕێگەی لێ گرت، وەک هەندێک لەو بەهێزانەی کە لە کاتی تووڕەبووندا دەیکەن. بەلام بەتەواوەتی ئەو شتەی ئامادە نەکردبوو کە دەیویست بیڵێت. بۆ ساتێک هیچ دەنگێک لە دەمیەوە نەهاتە دەرەوە، وەک ئەو کاتانەی کە دەیویست هاوار بکات، "ماست،" بەلام دەنگی نەدەهات.

مامۆستا ئێدا وتی، "تۆ لە شوێنێک دەستت کردووە بە کارکردن؟"

مەولود وتی، "نەخێر، باوکم مرد."

هەندێک لە مامۆستاکان ناو دەستی ئەو قوتابییانەیان دەکردەوە کە فرۆشیارییان دەکرد و دەیانشاردەوە کە فرۆشیاری دەکەن، کاتێک سەیری پێستە مردوو و مێخەکەکانی لەپی دەستیانیان دەکرد، ڕاستییە شەرمهێنەکەیان دەزانی،

دەمولێویـان هەڵدەقورتانـد.

مامۆستا ئێدا وتی، "بۆخۆتـان خۆش بن، تۆ نـاوت چییە، ژمارەکەت چەند بوو؟"

ئەوانەی لە دەرگاکەدا کۆ ببوونەوە بە مەولودیان دەوت، "کورم بێدەنگ بە، بەئاگا بە، ڕقت لێ هەڵدەگرێت." بە چاو و برۆ ئیشارەتیان دەکرد. مامۆستا ئێدا لە قەرەباڵغییەکە ترسا، بێ ئەوەی گوێ لە وەڵامەکەی مەولود بگرێت چووە دەرەوە.

مەولـود تاکـو کۆتاییی سـاڵ چـووە وانەکانـی مامۆسـتا ئێداوە. بـەڵام لەبـەر ئـەوەی لـە ڕیزەکانـی دواوەدا دادەنیشـت، چەنـد وانەیەکیشـی لەدەسـت دابـوو چونکـە نەهاتبـوو بـۆ قوتابخانـە، ئیتـر ئەسـتەم بـوو بتوانێـت فریـا بکەوێـت وانەکـە تێبگات.

کاتێک لە یەکەم هەفتەی مانگی حوزەیراندا کارت دابەش کرا، مەولـود بینیی کە لە وانەی ئینگلیزیدا دەر نەچووە.

فەرهاد وتی، "بینیت، ڕقی لێ هەڵگرتیت. بە باوکت مەڵێ، دەتکوژێت."

مەولودیش بەو شێوەیە بیری دەکردەوە، بەڵام دەیشیزانی کە باوکی دەیەوێت بە چاوی خۆی بڕوانامەکەی ناوەندیی ببینێت. مەولـود بـە درێژاییی هاویـن لـە لادێ سـەعی کـرد، بۆ ئەوەی قۆناغی ناوەندی تەواو بکات. فەرهەنگی تورکی-ئینگلیزیشی نەبوو، هیچ کەسێکیش نەبوو کە یارمەتیی بدات لە لادێ. لە مانگی تەممـوزدا دەسـتی کـرد بـە وانەوەرگرتـن لـە کـوڕی پیاوێـک کـە لـە ئەڵمانیـاوە بـە ئۆتومبێلـە مارکـە تانوسـەکەی و تەلەڤزیۆنەکەیانـەوە هاتبوونـەوە بـۆ لادێـی گوموشدەرەی دراوسێیان. مەولـود دەبووایـە هەمـوو جارێـک

سێ کاتژمێر ڕێی بکردایە بۆ چوون و هاتن، تاکو لەبن درەختێکدا بۆ ماوەی کاتژمێرێک لەگەڵ ئەو کوڕەدا کتێب بگرن بە دەستیانەوە، کە لە قۆناغی ناوەندی بوو لە ئەڵمانیا، تورکییەکەی و ئینگلیزییەکەشی شێوازی دوانی ئەڵمانی بوون. کاتێک لە ڕێگە شاخاوییەکەی لادێدا لەنێوان تاوێر و درەختە بەڕووەکاندا ڕێی دەکرد، سەیری دەشتەکەی خوارەوەی دەکرد و بیری دەکردەوە کە چۆن لەگەڵ مامۆستا ئێدادا یەکتر دەبینن لە تاقیکردنەوەی وانەی ئینگلیزیدا. بە زانیارییەکەی و بەو متمانەیەی کە بە خۆیەتی، کاری لەو دەکرد و داوای لێبوردنی لێ دەکرد. ئیتر بە شێوەیەک بیری دەکردەوە کە وانەی زمانی ئینگلیزی بۆ ئەوەیە بڕوانامەی ناوەندی وەر بگریت، نەک بۆ بەکارهێنان، شتێکە وەک ئەو حەبانەی یونیسێف، کە دەبێت قووتی بدەیت. هەستی بەوەش دەکرد کە شانسدارە، لەبەر ئەوەی کە ئەم حەبی ئینگلیزییە بە عەشقی مامۆستا ئێداوە قووت دەدات، نەک بە شیرە بۆنپیسەکەوە.

مەولود و باوکی بۆ ئەوەی فریای تاقیکردنەوەی کۆتایی مانگی ئاب بکەون، دوو هەفتە پێشتر گەڕانەوە بۆ ئیستانبوڵ. ماڵەکەی سیستەپە لە کۆتایی هاویندا بۆنی شێ و گڵی لێ دەهات، هەر وەک سێ ساڵ لەمەوبەر کە مەولود بۆ یەکەم جار هاتبووە ناوی.

دوای سێ ڕۆژ کاتێک لە گەورەترین پۆلی ئامادەیی ئەتاتورکی کوڕاندا چووە تاقیکردنەوەوە، مامۆستا ئێدا وەک چاودێرێک نەهات. مەولود دڵی شکا. بەڵام لەسەروو ئەوەشەوە هەر هەوڵی دا، بەسەرکەوتنەوە وەڵامی پرسیارەکانی دایەوە.

دوای دوو هەفتە، لەو ڕۆژانەدا کە دەستی دەکرد بە خوێندنی ئامادەیی، کاتێک چوو بۆ ژوورەکەی ئێسکەپەیکەر بۆ ئەوەی بڕوانامەی ناوەندی وەر بگرێت، بۆی دەر کەوت کە مامۆستا ئێدا گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەیەکی تر.

ئێسکەپەیکەر وتی، "ئافەرین ١٠١٩، ئەوە بڕوانامەی ناوەندیتە!"

مەولود شەو بڕوانامەکەی پیشانی باوکی دا، کە بە درێژاییی ڕۆژ هەر لە جانتاکەیدا دەری دەهێنا و سەیری دەکرد.

باوکی وتی، "ئیتر دەتوانیت ببیت بە پۆلیس، یاخود پاسەوان."

# یەکەم و کۆتا گفتوگۆ لەنێوان بکوژ و کوژراودا

**[لە ڕۆمانی *بەفر*ەوە. لەلایەن بەڕێوبەری ئەنستیتۆتی پەروەردە و فێرکردنەوە بەنهێنی تۆمار کراوە، کە لە کۆتاییی گفتوگۆکەدا کوژراوە. لە ناوەڕاستی ساڵەکانی ١٩٩٠دا دوو کەس لە دوکانێکی شیرینیی شاری قارسدا.]**

"ئەم کاتەت باش مامۆستا، من دەناسیتەوە؟"

"نەخێر، ناتناسمەوە."

"منیش بەو شێوەیە بیرم لێ کردبووەوە مامۆستا. چونکە هیچ یەکتریمان نەناسیوە. دوێنێ شەو و ئەم بەیانییە دوو جار هەوڵم دابوو کە ئێوە ببینم. دوێنێ پۆلیسەکان لە دەرگای قوتابخانەدا گەڕاندیانمەوە. ئەم بەیانییەش هەرچەندە توانیم بچمە ژوورەوە، بەڵام سکرتێرەکەتان نەیهێشت ئێوە ببینم. منیش ویستم پێش ئەوەی بچیت بۆ خوێندنگەکە لەناو دەرگاکەدا بتانبینم. لەو کاتەدا منتان بینی. مامۆستا بیرت دەکەوێتەوە؟"

"بیرم ناکەوێتەوە."

"منتان بیر ناکەوێتەوە، یاخود بیری ئەوەتان ناکەوێتەوە کە منتان بینیبێت؟"

"دەتەوێت لەگەڵ مندا باسی چی بکەیت؟"

"لە ڕاستیدا لەگەڵ تۆدا دەمەوێت چەندەها کاتژمێر، چەندەها ڕۆژ لەبارەی هەموو شتێکەوە قسە بکەم. پرۆفیسۆرێکی کشتوکاڵی زۆر بەڕێز و خوێندەوار و مرۆڤێکی زۆر ڕۆشنبیریت. بەداخەوە ئێمە نەمانتوانی بخوێنین، بەلام زۆرم خوێندۆتەوە لەبارەی بابەتێکەوە. ئەو بابەتەی کە دەمەوێت لەگەڵ ئێوەشدا باسی بکەم ئەوەیە. مامۆستا بمبەخشە، کاتتان لێ ناگرم، وایە؟"

"ئەستەغفیروڵا، نەخێر فەرموو."

"بمبەخشە مامۆستا، ئەگەر مۆڵەتم بدەیت دەتوانم لەگەڵتدا دانیشم؟ چونکە بابەتەکە، بابەتێکی بەرفراوانە."

"تکات لێ دەکەم، فەرمووون." (دەنگی کورسیڕاکێشان و دانیشتن.)

"مامۆستا دەبینم چۆرەکی بەگوێز دەخۆیت. لە شاری تۆکاتی ئێمە دارگوێزی زۆر گەورەی لێیە. قەت چوویت بۆ شاری تۆکات؟"

"نەخێر بەداخەوە."

"زۆر خەمبار بووم مامۆستا. تکایە ئەگەر هاتیت لای من بمێننەوە. هەموو تەمەنم، سیوسێ ساڵم لە تۆکات بەسەر برد. تۆکات زۆر خۆشە. تورکیاش زۆر خۆشە." (کەمێک بێدەنگی)، "بەلام بەداخەوە مەملەکەتەکەمان ناناسین، مرۆڤەکانی خۆمان خۆش ناوێت. هەتا خیانەت و بێڕێزی

بەرامبەر بەم وڵاتە و بەم میللەتە، بە هونەر و کارامەیی دەژمێردرێت. بمبەخشە مامۆستا، دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم، تۆ ئەتایست نیت، وایە؟"

"ئەتایست نیم."

"وا دەڵێن، بەڵام منیش هیچ ئەگەر نادەم بەوەی کەسێکی خوێنەواری وەک ئێوە حاشا- نکوڵی- لە خوا بکات. پێویست ناکات بیڵێم، یەهوودییش نیت، وایە؟"

"یەهوودییش نیم."

"مسوڵمانیت."

"حەمد بۆ خوا مسوڵمانم."

"مامۆستا دەبینم پێدەکەنت، بەڵام تکات لێ دەکەم بەجیددی وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەرەوە. چونکە بۆ ئەوەی وەڵامێک لە ئێوە وەر بگرم بۆ ئەم پرسیارەم، لە تۆکاتەوە بەم زستان و بەفرە هاتووم بۆ ئێرە."

"لە تۆکات چیت لەبارەی منەوە بیستووە؟"

"مامۆستا ڕۆژنامەکان لە ئیستانبوڵ ئەوە نانووسن کە ئێوە لە قارس ناهێڵن کچە لەچکبەسەرە بالاپۆشەکان بێنە ناو قوتابخانەوە. ئەوان سەرقاڵی شەرمەزاریی کچە مانکەنەکانی ئیستانبوڵن، بەڵام لە تۆکاتە جوانەکەماندا کەناڵێکی ڕادیۆیی مسوڵمانمان هەیە بە ناوی *بایراک*ەوە[1]، هەواڵی ئەو ناحەقییانە دەدات کە لە مەملەکەتەکەماندا بەرامبەر مسوڵمانەکان و دیندارەکان دەکرێت."

"من ناحەقی ناکەم بەرامبەر مسوڵمانان، منیش لە خوا دەترسم."

---

١ بایراک: ئاڵا

"مامۆستا دوو ڕۆژە لە ڕێگەی بەفراوی و گەردەلوولدا ڕێ دەکەم؛ لەناو پاسەکەدا بەردەوام بیرم لە ئێوە کردەوە، زۆر باشیش دەمزانی کە دەڵێیت باوەڕم پێ بکەن من لە خوا دەترسم! ئەوکات زۆر بیرم لەوە کردەوە کە ئەم پرسیارە لە ئێوە دەکەم. پرۆفیسۆر نوری یلمازی بەڕێز، ئەگەر لە خوا دەترسیت، مامۆستای بەڕێز، ئەگەر باوەڕت هەیە کە قورئانی کەریم فەرموودەکانی خوایە، ئەوکات پێم بڵێ بزانم لەبارەی سیویەکەمین ئەو ئایەتە جوانەی سورەتی نورەوە چۆن بیر دەکەیتەوە."

"لەم ئایەتەدا، بەڵێ، زۆر بە شێوەیەکی ئاشکرا ئاماژە بەوە دەکات کە ژنەکان سەریان داپۆشن، هەتا سیماشیان بشارنەوە."

"سەلامەت بیت مامۆستا، زۆر جوان و بە شێوەیەکی ڕاستگۆیانە وتت! ئەوکات دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم. ئەم فەرمانەی خوا چۆن دەگونجێنیت لەگەڵ ڕێگەپێنەدانتان بۆ چوونەژوورەوەی کچە لەچکبەسەرەکانمان بۆ ناو قوتابخانە؟"

"فەرمانی دەوڵەتە لائیکەمانە کە ڕێگە نەدرێت کچە لەچکبەسەرەکان بچنە خوێندنگەکان و هەتا قوتابخانەکانیشەوە."

"مامۆستا بمبەخشە، دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم: مامۆستا فەرمانی دەوڵەت گەورەترە لە فەرمانی خوا؟"

"پرسیارێکی جوانە. بەڵام ئەمانە لە دەوڵەتێکی لائیکدا شتی جیاوازن."

"مامۆستا زۆر ڕاست دەکەیت، با دەستت ماچ بکەم. مامۆستا مەترسە دەستتم بدەرێ، بمدەرێ، سەیرکە دەستت

بەتامەزرۆییەوە ماچ دەکەم. ئۆخەی. خوا لێت ڕازی بێت. تێگەیشتیت کە چەندە ڕێز لە ئێوە دەگرم. ئێستا مامۆستا تکات لێ دەکەم دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم؟"

"تکایە فەرموو."

"مامۆستا، باشە لائیکبوون واتای بێدینییە؟"

"نەخێر."

"ئەوکات کچە مسوڵمانەکانمان لە کاتێکدا پەیڕەوی پێویستیی دینەکەیان دەکەن، بۆچی بە بیانووی لائیکییەوە ڕێگەیان پێ نادرێت بچنە وانەکانیانەوە؟"

"بەخوا کوڕم، بە مناقەشەکردنی ئەم بابەتانە ناتوانین بگەینە ئەنجامێک. بە درێژاییی ڕۆژ لە تەلەڤزیۆنەکانی ئیستانبوڵدا ئەم بابەتانە باس دەکرێت، بەڵام ئایا ئەنجامێکی هەبووە؟ نە کچەکان لەچکەکانیان فڕێ دەدەن، نە دەوڵەتیش ڕێگەیان پێ دەدات کە بە لەچکەوە بچنە وانەکانیانەوە."

"باشە مامۆستا، دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم؟ ببورە بەڵام لێسەندنەوەی مافی خوێندن لەو کچە ئیشکەر و بەڕەوشت و ملکەچانەمان کە سەریان دادەپۆشن، کە بە هەزار هەوڵ و تەقەللا و ڕەنجی ئێمە پێ گەیشتوون، هیچ دەگونجێت لەگەڵ پەروەردە و خوێندن و ئازادیی دینی وڵاتەکەماندا؟ تکات لێ دەکەم مامۆستا ویژدانتان پەسەندی ئەمە دەکات، پێم بڵێ؟"

"ئەگەر ئەو کچانە ئەوەندە ملکەچ بن، ئەوکات دەتوانن لەچکەکانیشیان لە سەریان بکەنەوە. کوڕم تۆ ناوت چییە، ناوونیشانت چییە، کارت چییە؟"

"مامۆستا من لە چایخانەی شەنلەر چایچیم، کە دەکەوێتە تەنیشت گەرماوی بەناوبانگی پەروانەوە لە تۆکات. لەوێ من

بەرپرسیارم لە ئاگردان و کتری و قۆرییەکان. ناوم گرنگ نییە. بە درێژاییی هەموو ڕۆژیش گوێ لە ڕادیۆی *بایراک* دەگرم. هەندێک جار مێشکم کاریگەر دەبێت بە ناحەقییەک کە بەرامبەر مسوڵمانەکان دەکرێت. مامۆستا لەبەر ئەوەی لە وڵاتێکی دیموکراسیدا دەژیم، وەک مرۆڤێکی ئازاد دەژیم، بەگوێرەی مێشکی خۆم دەکەم، لە هەر شوێنێکی تورکیادا بێت سواری پاس دەبم و دەچم بۆ لای ئەو کەسەی کە کاری کردۆتە سەر مێشکم، ڕێک بەرەوڕوو پرسیاری ئەم ناحەقییەی لێ دەکەم. لەبەر ئەوە مامۆستا تکات لێ دەکەم وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە. فەرمانی دەوڵەت گەورەیە یاخود فەرمانی خوا؟"

"بەم مناقەشەیە ناگەینە هیچ ئەنجامێک کوڕم، تۆ لە چ هۆتێلێک دەمێنیتەوە؟"

"هەواڵ دەدەیت بە پۆلیس؟ مامۆستا لە من مەترسە. سەر بە هیچ کۆمەڵەیەکی دینی نیم. نەفرەت لە تیرۆر دەکەم، باوەڕم بە خەباتی فیکری و خۆشەویستیی خوا هەیە. سەرەڕای ئەوەی ئەوەندە کەسێکی تووڕەم، بەڵام لە ئەنجامی خەباتی فیکریدا پەلەپیتکەیەکم لە کەس نەداوە. بەتەنها دەمەوێت وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەیتەوە. مامۆستا، بمبەخشە، سەرەڕای ئەوەی خوا لە قورئانی کەریمدا، لە سورەتی ئەحزاب و نوردا زۆر بەئاشکرا دەستنیشانی کردووە، نارەحەتیی ئەو کچانەی کە لە دەرگای زانکۆکاندا زوڵمیان لێ دەکەن، ئازاری ویژدانتان نادات؟"

"کوڕم، قورئانی کەریم دەشڵێت کە دەستی دز ببڕن، بەڵام دەوڵەتەکەمان نایبڕێت. بۆچی ڕووبەڕووی ئەمە نابیتەوە؟"

"وەلامێکی زۆر جوانە مامۆستا. دەستت ماچ دەکەم. بەلام دەستی دز لەگەڵ نامووسی کچەکانماندا هەمان شتە؟ بەگوێرەی ئەو ئامارەی کە لەلایەن پرۆفیسۆر مارڤین کینگی ڕەشپێستی مسوڵمانەوە کراوە، لەو وڵاتە ئیسلامییانەی کە ژنی باڵاپۆشیان تێدایە، ڕووداوی دەستدرێژیکردنە سەر نامووس ئەوەندە لە کەمبوونەوەدایە کە دەتوانیت بڵێی نییە، هیچ ڕێکەوتی ڕووداوی وەرسکردن ناکرێت. چونکە ژنێک لەناو سەرچەفە باڵاپۆشەکەیدا، لەپێشدا بە پۆشاکەکەی بە کوڕەکان دەڵێت، 'تکاتان لێ دەکەم وەڕسم مەکەن.' مامۆستا تکات لێ دەکەم دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم: بە دوورخستنەوەی کچە لەچکبەسەرەکان لە خوێندن، دوورخستنەوەیان لە کۆمەڵگە، بە خۆڕووتکردنەوەیان و پاشان تاجلەسەرکردنیان، بە سووککردنی نامووسی ژنەکانمان وەک چۆن لە ئەورووپادا ڕووی دا دوای شۆڕشی سێکسی، بمبەخشە دەمانەوێت خۆمان بخەینە دۆخی گەوادییەوە؟"

"کوڕم من چۆرەکەکەمم خوارد، داوای لێبوردن دەکەم، من دەڕۆم."

"مامۆستا لە جێگەی خۆت دانیشە، دانیشە با ئەمە بەکار نەهێنم. مامۆستا دەزانیت ئەمە چییە؟"

"دەمانچە."

"بەڵێ مامۆستا، لە کەموکورتیم ببورە، من لەبەر خاتری ئێوە ئەوەندە ڕێگەم بڕیوە، کەسێکی گەمژە نیم، بیرم کردەوە لەوانەیە هیچ گوێشم لێ نەگرێت، لەبەر ئەوە ڕێوشوێنم بۆ خۆم ئامادە کرد."

"کوڕم، تۆ ناوت چییە؟"

"وەحید سوزمەن، سالیم فلان، مامۆستا چ گرنگییەکی هەیە. من پارێزەرێکی بێناوی ئەو قارەمانە بێناوانەم کە لەم وڵاتە لائیک و ماتریالیستەدا تووشی ناحەقی دەبن. سەر بە هیچ رێکخراوێک نیم. رێز لە مافەکانی مرۆڤ دەگرم، هیچ ئارەزووم لە توندوتیژی نییە. لەبەر ئەوە دەمانچەکەم دەخەمە گیرفانمەوە، بەتەنها داوا لە ئێوە دەکەم وەڵامی پرسیارێکم بدەنەوە."

"باشە."

"مامۆستا، بە فەرمانێک کە لە ئەنقەرەوە هاتبوو، لەپێشدا هیچ حسابێکتان بۆ ئەو کچە عاقڵ و ئیشکەر و گلێنەی چاوی باوک و دایکیانە نەکرد، کە هەموویان یەکەمی پۆلەکەیانن. ئەگەر لە پۆلدا ئامادەش بووبن، لەبەر ئەوەی لەچکبەسەر بوون، وەک نەبوو حسابتان بۆ کردوون. حەوت قوتابی لەگەڵ مامۆستاکەیاندا دانیشتوون، یەکێکیان لەچکبەسەر بووە، حسابتان بۆ لەچکبەسەرەکە نەکرد و داوای شەش چاتان لە چایچییەکە کردووە. ئەو کچانەتان گریاند کە بە نەبوو سەیرتان دەکردن. بەمەشەوە نەوەستان، بە فەرمانێک کە تازە لە ئەنقەرەوە هاتبوو، لەپێشدا نەتانهێشت ئەوان بێنە پۆلەوە و کردتاننە راڕەوەکانەوە و دواتر لە راڕەوەکانیشەوە دەرتان کردنە دەرەوەی دەرگا. چنگێک کچی قارەمان کە بەرهەڵستییان دەکرد و سەریان رووت نەدەکرد، کاتێک لە دەرگای قوتابخانەدا لە سەرماکەدا دەلەرزین و چاوەڕوانییان دەکرد بۆ ئەوەی دەردەکانیان بگەیێنن بە کەسانی تر، تەلەفۆنتان کرد و پۆلیستان بانگ کرد."

"پۆلیسەکان ئێمە بانگمان نەکردن."

"مامۆستا، لەبەر ئەوەی دەمانچە لە گیرفانمدایە مەترسە، درۆم لەگەڵدا مەکە. پرسیارەکەم ئەوەیە، شەوی ئەو ڕۆژەی کە پۆلیسەکان کچەکانیان بەڕاکێشان دەستگیر کردووە، تۆ بە چ ویژدانێکەوە توانیوتە بخەویت."

"بەدڵنیایی کردنی بابەتی لەچکپۆشی بە نیشانەیەک و یارییەکی سیاسی، کچەکانمانی زیاتر نائاسوودە کرد."

"یاریی چی مامۆستا، بەداخەوە کچێکیش کە لەنێوان قوتابخانە و ناموسدا گیری خواردبوو، کەوتبووە ئاستەنگییەوە و خۆی کوشت. ئەمە یارییە؟"

"کوڕم، زۆر تووڕەیت، بەڵام هیچ بە عەقڵتدا نەهاتووە لەپشتی بەسیاسیکردنی ئەم بابەتی لەچکپۆشییەوە، دەستی ئەو هێزە دەرەکییانەی دەرەوەی تێدایە کە دەیانەوێت تورکیا بکەن بە دوو بەشەوە، لاوازی بکەن؟"

"مامۆستا ئەگەر تۆ ڕێگە بەم کچانە بدەیت بێنە قوتابخانە، کێشەی کچی لەچکبەسەر دەمێنێت!"

"کوڕم تەنها بە ویستی منە؟ ئەمانە داواکاریی ئەنقەرەن. ژنەکەی خۆیشم بالاپۆشە."

"مامۆستا ماستاوم بۆ مەکە، وەڵامی پرسیارەکەی کەمێک پێش ئێستام بدەرەوە."

"کام پرسیارەت؟"

"ویژدانت ئازارت دەدات؟"

"کوڕم منیش باوکم، بەدڵنیایی منیش خەمبارم بە دۆخی ئەم کچانە."

"سەیرم بکە، من زۆر باش دەزانم کە خۆڕاگر بم، بەڵام پیاوێکی زۆر تووڕەم. ئەگەر تووڕە ببم، ئیتر کار لە

کار دەترازێت. من لە زیندان لە مرۆڤێکم دا لەسەر ئەوەی کاتێک باوێشکی دا دەستی نەگرتبوو بە دەمیەوە؛ هەموو کەسانی ناو قاوشەکەم کرد بە پیاو و هەموویان ڕزگاریان بوو لە خووە خراپەکانیان و دەستیان کرد بە نوێژکردن. ئێستا تۆ ئەمسەر و ئەوسەرم پێ مەکە، دەی بزانم وەڵامی پرسیارەکەم بدەرەوە. من کەمێک پێش ئێستا چیم وت؟"

"کوڕم وتت چی، ئەو دەمانچەیە بهێنە خوارێ."

" پرسیاری ئەوەم کرد، تۆ کچت هەیە، خەمباریت؟"

"داوای لێبوردن دەکەم کوڕم، پرسیاری چیت کرد؟"

"ئێستا لە دەمانچەکەم مەترسە و ماستاوم بۆ بکەیت. بیرت بکەوێتەوە کە پرسیارەکەم چی بوو..." (کەمێک بێدەنگی.)

"پرسیاری چیت کردبوو؟"

"بێئیمان، پرسیبووم کە ویژدانت ئازارت دەدات."

"بەدڵنیایی ئازارم دەدات."

"ئەوکات بۆچی ئەمە دەکەیت، بێشەرەف."

"کوڕم من مامۆستایەکم لە تەمەنی باوکتدام. لە قورئانی کەریمدا فەرموودەیەکی وا نووسراوە کە دەمانچە بەرەوڕووی گەورەکەتان بگرن، سووکایەتی پێ بکەن؟"

"تۆ هیچ ناوی قورئانی کەریم مەخەرە سەر دەمت، باشە. بەو شێوەیەش سەیری چەپ و ڕاست مەکە، وەک بڵێی سواڵ دەکەیت بۆ یارمەتییەک، ئەگەر هاواریش بکەیت هیچ بەزەییەک پیشان نادەم، دەتکوژم، ئێستا تێگەیشتیت؟"

"تێگەیشتم."

"ئەوکات وەڵامی ئەم پرسیارەم بدەرەوە: ئەگەر

کچەکانمـان لەچکەکانیـان لـە سـەریان بکەنـەوە چ سـوودێکی دەبێـت بـۆ مەملەکەتەکەمـان؛ هۆکارێکـم پـێ بڵـێ کـە ناخـت و ویژدانـت پەسـەندی کردبێـت، بـۆ نموونـە بڵـێ ئەگـەر لەچـک نەکـەن ئـەوکات ئەوروپییـەکان زیاتـر وەک مرۆڤێـک سـەیری دەکـەن، ئـەوکات هیـچ نەبێـت مەبەسـتەکەت تێدەگـەم، ناتکـوژم، ئـازادت دەکـەم."

"کـورە بەڕێزەکـەم. منیـش کچێکـم هەیـە، سـەری ڕووتـە. چـۆن هیـچ دەسـتوەردانی دایکـی ناکـەم کـە لەچـک دەدات بـە سـەریدا، بـەو شـێوەیەش هیـچ دەسـتوەردانی ئـەو ناکـەم."

"بۆچـی کچەکـەت لەچـک نـاکات، دەیەوێـت ببێـت بـە هونەرمەند[1]؟"

"هیـچ شـتێکی وەهـای بـە مـن نەوتـووە. لـە ئەنقەرە لـە بواری پەیوەندیـی کۆمەڵایەتیـدا دەخوێنێـت. کچەکـەم زۆر یارمەتیـی داوم لـەو کاتانـەدا، کـە بەداخـەوە، بـووم بـە نیشـانەیەک بـە هـۆی ئـەم بابەتـی باڵاپۆشـییەوە، زۆر ئەزیەتـم کێشـا، دڵتەنـگ بـووم، ناچـار بـووم گـوێ بگـرم لـە کەسـانی وەک تـۆ کـە لەسـەر حـەق تووڕە دەبـوون، تووڕەیـی دوژمنەکانـم، هەڕەشـە و دانپێدانـان، لـە ئەنقـەرەوە تەلەفۆنـی دەکـرد..."

"دەیـوت دەخیلیـت بـم باوکـە خـۆڕاگر بـە، بـا منیـش ببـم بـە هونەرمەنـد؟"

"نەخێـر کـوڕم، وا ناڵێـت. دەڵێـت باوکـە گیـان، منیـش ئەوەنـدە بەجـەرگ نەبـووم بەبـێ لەچـک بچمـە پۆلێکـەوە کـە هەمـوو کچانـی نـاو پۆلەکـە لەچکبەسـەر بـن، بـێ خواسـتی خـۆم منیـش

---

١ هونەرمەنـد: لێـرەدا وشـەی هونەرمەنـد بـە واتایەکـی لوغـزاوی وەک، خۆنوانـدن، پۆزلێـدان، خۆدەرخـەر بـەکار هاتـووە.

لەچکم دەکرد."

"باشە ئەگەر بێ خواستی خۆی لەچک بکات، چ زیانێکی هەیە؟"

"وەڵڵا من مناقەشەی ئەم شتانە ناکەم. تۆ بە منت وت هۆکارێکم پێ بڵێ."

"واتە، بێشەرەف، تۆ لەبەر کەیفی کچەکەی خۆت کچە دیندارە باڵاپۆشەکان لە دەرگای قوتابخانەدا بە دەستی پۆلیسەکان بەلێدان دەدەیت و زوڵمیان لێ دەکەیت و ڕێگە دەکەیتەوە بۆیان کە خۆیان بکوژن؟"

"هۆکاری کچەکەم، لە هەمان کاتدا هۆکاری زۆرینەی ژنانی تورکیایە."

"تێنەگەیشتم، لە کاتێکدا لە سەددا نەوەدی ژنانی تورکیا لەچک دەکەن، چ هونەرمەندێکی تر دەتوانێت هۆکارێکی هەبێت. زاڵمی بێشەرەف، شانازی بە خۆڕووتکردنەوەی کچەکەتەوە دەکەیت، بەڵام ئەمە بخە عەقڵتەوە، من پرۆفیسۆر نیم، بەڵام لەبارەی ئەم بابەتەوە لە تۆ زیاترم خوێندۆتەوە."

"بەڕێز تکاتان لێ دەکەم دەمانچەکەت بە ئاراستەی من مەگرە، تووڕە دەبیت، دواتر ئەگەر بتەقێت، لەوانەیە دڵگران ببیت."

"بۆچی دڵگران دەبم، من بۆ ئەوەی کافرێک بکوژم، گەشتێکی دوو ڕۆژیم کردووە بەناو بەفر و سەرمادا. قورئانی کەریم دەفەرموویێت کوشتنی ئەو زاڵمانەی زوڵم لە ئیماندارەکان دەکەن، ئەرکە. بەڵام لەبەر ئەوەی کە بەزەییم پێتدا هاتەوە، شانسێکی ترم دایتێ: یەک هۆکارم پێ بڵێ کە ویژدانت پەسەندی بکات لەبارەی لەچکنەکردن

و خۆڕووتکردنەوەی بالآپۆشەکانەوە، سوێند دەخۆم ئەوکات ناتکوژم."

"ئەگەر ژن لەچکەکەی دابکەنێت، لەناو کۆمەڵگەدا ئاسوودەتر دەبێت، بەڕێزتر دەبێت."

"لەوانەیە بۆ کچەکەی تۆ وا بێت، کە دەیەوێت ببێت بە هونەرمەند. بەڵام بە پێچەوانەوە، لەچککردن ژن لە دەستدرێژیکردن، پەلاماردان، سووککردن دەپارێزێت، هێناوییەتە دۆخێکەوە کە بەئاسوودەتر بتوانێت لەناو کۆمەڵگەدا بژی. وەک زۆرێک لەو ژنانەی کە دواتر لەچکیان کردووە و بالآپۆش بوون بە کۆنەسەماکاری سەمای ڕۆژهەڵاتی مەلاحەت شانداریشەوە کە دەڵێن بالآپۆشیی ژنی لەو بارە زەلیلییەدا دەر کردووە، کە لە کۆلآندا سەرنجی هەستە ئاژەڵییەکەی کوڕان ڕابکێشێت، لەگەڵ ژنەکانی تردا بکەوێتە ڕکابەرێتیی زیاتر سەرنجڕاکێشان، لەبەر ئەوە ڕزگاری دەکات لە باری ماددەیەکی زەلیل کە بەردەوام ئاراییشت بکات. وەک پرۆفیسۆر مێرڤن کینگی ڕەشپێستی ئەمەریکیش ئاماژەی پێ داوە، ئەگەر هونەرمەندی بەناوبانگ ئەلیزابێت تایلۆر لە کۆتا بیست ساڵیدا خۆی بالآپۆش بکردایە، شەرمی لە باری قەڵەوییەکەی نەدەکرد و لە نەخۆشخانەی عەقڵیدا نەدەکەوت و دڵخۆش دەبوو. مامۆستا ببەخشە، دەتوانم پرسیارێکت لێ بکەم: مامۆستا بۆچی پێدەکەنیت، قسەکەم زۆر پێکەنیناوییە؟" (کەمێک بێدەنگی). "دە بیڵێ بێشەرەفی ئەتایست، بۆچی پێدەکەنیت؟"

"کوڕە بەڕێزەکەم، باوەڕ بکە پێناکەنم، ئەگەر پێشکەنیبم لە داخ و تووڕەییدا پێکەنیوم!"

"نەخێر، بەباوەڕەوە پێکەنیت!"

"کوڕە بەڕێزەکەم، ناخم پڕە لە بەزەیی و خۆشەویستی بەرامبەر ئەو کەسانەی وەک تۆن، کچە بالاپۆشەکان، ئەو مرۆڤە گەنجانەی کە ئازار دەکێشن و باوەڕیان بە داخوازییەکانی خۆیان هەیە."

"بەخۆڕایی ماستاو مەکە. من ئازار ناکێشم. بەلام لەبەر ئەوەی بەو کچانە پێکەنیت کە خۆیان کوشتووە، ئێستا تۆ دەبێت ئازار بکێشیت. بەگوێرەی ئەوەی کە پێدەکەنیت هیچ پەشیمانیش نیت. ئەوکات با من یەکسەر دۆخەکەت پێ بڵێم. دادی موجاهیدی ئیسلامی دەمێکە حوکمی مردنی داوە بەسەر تۆدا، پێنج ڕۆژ پێش ئێستا لە تۆکات لە ئەنجامی دەنگدانەوە بڕیاری لەسەر درا، منیشیان نارد بۆ کوشتنت. ئەگەر پێنەکەنیتایە، یان پەشیمان بوویتایە، ئەوکات لەوانە بوو بمبەخشیتایە. ئەم کاغەزە بگرە، بڕیاری کوشتنەکەت بخوێنەرەوە بزانم..." (کەمێک بێدەنگی.) "بێ ئەوەی وەک ژن بگریت بە دەنگی بەرز بیخوێنەرەوە، دەی بێشەرەف، ئەگەر نا یەکسەر دەتکوژم."

"*من پرۆفیسۆر نوری یلمازی ئەتایست*، کوڕە بەڕێزەکەم من ئەتایست نیم..."

"دەی، بیخوێنەرەوە."

"کوڕم، ئەگەر بیخوێنمەوە تەقەم لێ دەکەیت، دەمکوژیت؟"

"ئەگەر نەیخوێنیتەوە دەتکوژم، دەی، بیخوێنەرەوە."

"*من وەک ئامرازێکی پلانە نهێنییەکەی بەکۆیلەکردن، سووککردن، بێدینکردنی مسولمانەکانی دەوڵەتی کۆماری تورکیا، ملکەچییان بۆ ڕۆژئاوا، ئەوەندە زوڵمم لەو کچە*

*موسـوڵمانانە کـردووە کـە پەیوەسـتن بـە دینەکەیانـەوە، لـە فەرمـوودەی قورئانـی کەریـم دەر ناچـن، سـەریان ڕووت ناکـەن، لـە کۆتاییدا کچێکـی مسـوڵمان لەبەر ئـەوەی بەرگـەی ئەم ئازارەی نەگرت، خۆی کوشت...* کوڕە بەڕێزەکەم، لێرەدا ئەگەر مۆڵەتم بدەیت نارەزایییەکم هەیە؛ تکات لێ دەکەم بەو ڕێکخراوەش بڵێ کە تۆیان ناردووە. ئەو کچەمان لەبەر ئەوە خۆی نەکوشت کە ڕێگەی پێ نەدراوە بچێتە قوتابخانە، یاخود باوکی ئەزیەتی دابێت و زۆری لێ کردبێت، وەک ڕێکخراوی ئیستخباراتی میللی بە ئێمەی ڕاگەیاند، بەداخەوە بە هۆی ئازاری عەشقەوە خۆی هەڵواسیوە، خۆی کوشتووە."

"بەڵام لەناو ئەو نامەیەدا وا نالێت کە دوای مردنی جێ ماوە."

"کوڕم هەتا ئەوەشت پێ بڵێم... - تکات لێ دەکەم ئەو دەمانچەیە دابگرە - ئەم کچە نەزانەمان، هێشتا پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکات، کاتێک بەبێ بیرکردنەوە کچێنیی خۆی داوە بە پۆلیسێک، کە بیستوپێنج ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە، بەداخەوە دواتر کە پۆلیسەکە پێی وتووە ژنی هەیە و لەگەڵ ئەودا هیچ نیەتی هاوسەرگیری نییە..."

"بێدەنگ بە سووک و تڕۆ. کچە قەحبەکەی تۆ ئەو کارە دەکات."

"مەکە کوڕم، مەکە منداڵەکەم. ئەگەر من بکوژی داهاتووی تۆش ڕەش دەبێت."

"بڵێ پەشیمانم!"

"کوڕم پەشیمانم، تەقە مەکە."

"دەمت بکەرەوە، لوولەی دەمانچەکە دەخەمە دەمتەوە...

ئێستا تۆ پەنجەت بخەرە سەر پەنجەی من لەسەر پەلەپیتکەی دەمانچەکە و بیتەقێنە. وەک بێئیمانێک دەتۆپیت، بەڵام هیچ نەبێت بەشەرەفەوە دەتۆپیت." (کەمێک بێدەنگی).

"کورِم، تەماشام بکە کەوتومەتە چ دۆخێکەوە، لەم تەمەنەمدا دەگریم، لێت دەپارِێمەوە، بەزەییت بە مندا نەیەتەوە، بەزەییت بە خۆتدا بێتەوە. داهاتووی تۆش رِەش دەبێت، دەبیت بە بکوژ."

"ئەوکات پەلەپیتکەکە خۆت رِای بکێشە! تۆش ببینە کە خۆکوشتن ئازارێکی چۆنە."

"کورِم، من مسوڵمانێکم، دژی خۆکوشتنم!"

"دەمت بکەرەوە." (کەمێک بێدەنگی). "بەو شێوەیە مەگری... پێشتر هیچ بە عەقڵتدا نەهات کە رِۆژێک دێت دەبێت حساب بدەیەت. مەگری، ئەگینا دەتکوژم."

(دەنگی گارسۆنە پیرەکە لە دورەوە). "ئەفەندی، چاکەتان بهێنم بۆ سەر ئەم مێزە، دەتانەوێت؟"

"نەخێر. ئێستا هەڵدەستم."

"سەیری گارسۆنەکە مەکە، بەردەوام بە لە خوێندنەوەی بریاری کوشتنەکەت."

"کورِم، بمبەخشن."

"دەڵێم بیخوێنەرەوە."

"*شەرم لە هەموو ئەو شتانە دەکەم کە کردوومن، دەزانم حەقمە کە بمرم، بۆ ئەوەی خوای گەورە بمبەخشێت...*"

"دەی بیخوێنەرەوە..."

"کورِە بەرِێزەکەم، واز بهێنە با ئەم پیاوە پیرە کەمێک بگری. واز بهێنە با بۆ کۆتا جار بیر لە ژنەکەم و کچەکەم

بکەمـەوە."

"بیر لـەو کچـە گەنجانـە بکـەرەوە کـە زوڵمت لـێ کردوون. یەکێکیـان تووشـی تێکچوونـی بـاری دەروونـی بـوو، چواریـان لـە پۆلـی سـێدا دەر کـران لـە قوتابخانـە، یەکێکیشـیان خـۆی کوشـت. لەبـەر ئـەوەی لـە بەردەمـی دەرگای قوتابخانـەدا لـە سـەرمادا دەلەرزیـن، هەموویـان تایـان لـێ هـات، لـە جێگـەدا کەوتـن، هەموویـان ژیانیـان لەدەسـت دەر چـوو."

"کوڕە بەڕێزەکـەم، مـن زۆر پەشـیمانم. بەڵام ئـەوە دەهێنێت تۆش بـە هـۆی کوشـتنی کەسـێکی وەک منـەوە ببیت بـە بکوژ، بیر لـەوە بکـەرەوە."

"باشـە." (کەمێک بێدەنگی). "مامۆسـتا مـن بیرم لـێ کردەوە، سـەیرکە چـی هـات بـە عەقڵمدا."

"چی؟"

"مـن بـۆ ئـەوەی تـۆ بدۆزمـەوە، سـزای کوشـتنەکەت بـدەم، بـۆ مـاوەی دوو ڕۆژ لـەم شـارە سـەفیلەی قارسـدا بەبەتاڵـی سـووڕامەوە. ڕێـک لـەوەدا بـووم کـە بیـرم دەکـردەوە، دەمـوت قیسـمەت نەبوو، بلیتـی گەڕانـەوەی تۆکاتـم کـڕی، دواتـر هاتـم بـۆ ئـەوەی چایـەک بخۆمـەوە و..."

"کوڕەکـەم، ئەگـەر بیـر لـەوە دەکەیتـەوە مـن بکوژیـت و سـواری دوایین پـاس ببیـت و لـە قـارس ڕابکەیـت، ئـەوە بزانـە کـە ڕێگـەکان بـە هـۆی بەفـرەوە داخـراون، پاسـی کاتژمێـر شـەش نـاڕوات، دوایـی پەشـیمان دەبیتـەوە."

"ڕێـک لـە گەڕانـەوەدا بـووم، خـوا تـۆی ڕەوانـە کـرد بـۆ ئـەم شـیرینیخانەی یەنـی حەیاتـە. واتـە خـوا تـۆ نابەخشـێت، مـن بتبەخشـم؟ کۆتـا قسـەت بکـە، شـایەتمان بهێنـە."

"کورپم لەسەر کورسییەکەت دانیشە، ئەم دەوڵەتە هەمووتان دەستگیر دەکات، هەمووتان هەڵدەواسێت."

"شایەتمان بهێنە."

"کورپم هێمن بە، بۆستە دانیشە، جارێکی تریش بیر بکەرەوە. پەنجەی پێدا مەنێ، بۆستە." (دەنگی تەقە و گرمەگرمی کورسییەک). "کورپم مەکە!" (دەنگی دوو تەقەی تر. بێدەنگی، نرکەیەک، دەنگی تەلەڤزیۆنەکە. دەنگی تەقەیەکی تر. بێدەنگی.)

# ماچ

**[لە *کتێبی ڕەشـەوە*. لە ساڵی ١٩٨٠دا گۆشەنووس جەلال سالیک بیر لە گەنجێتیی خۆی دەکاتەوە.]**

جا ڕێک هەفتەیەک لەمەوبەر، یەکێک سڵاوی بۆ ناردیت. پێم وت، "بەدڵنیاییی سڵاوەکەت دەگەیەنم،" بەلام تاکو سواری ئوتومبێلەکە بووم بیرم چووبووەوە. سڵاوەکە نا، ئەو پیاوەم بیر چووبووەوە کە سڵاوەکەی ناردبوو. بۆ ئەمەش خەمبار نیم. بە من بێت، مێردێکی عاقڵ، پێویستە هەموو ئەو کوڕانەی بیر بچێتەوە کە سڵاو دەنێرن بۆ ژنەکانیان. چونکە ئەمە دنیایە، نەوەک شتێک ڕوو بدات. بەتایبەتی ئەگەر ژنەکەتان ژنی ماڵەوە بێت: ئەو کەسە بێشانسەی کە پێی دەڵێن ژنی ماڵەوە، لە ژیانیدا جگە لە خاوەنی دوکان و ئەو بەقاڵانەی کە لەناو بازاڕ دەیانبینێت، جگە لە خزمان و دەوروبەری، جگە لە مێردە بێزارکەرەکەی، کوڕی تر نابینێت. ئەو کاتە ئەگەر یەکێک سڵاوی بۆ بنێرێت، بیر لەو کەسە هەستناسکە دەکاتەوە، کاتیشی هەیە بۆ ئەمە. بەڕاستی ئەم کەسانە ناسکیشن. بۆ خاتری خوا لە کۆندا نەریتێکی وەها هەبوو؟

لەو زەمانە کۆنە خۆشانەدا ئەگەر کەسێکی ناسک هەبووایە، ڕێزی دەنارد بۆ حەرەمێکی نادیار و بێناوونیشان. میترۆ کۆنەکان باشتر بوون.

دەزانم ئەو خوێنەرانەم کە دەزانن هاوسەرگیریم نەکردووە، هیچ هاوسەرگیریم نەکردووە، لەبەر ئەوەی کە ڕۆژنامەنووسم، هیچ هاوسەرگیرییەک ناکەم، لە دەستپێکردنی یەکەم ڕستەوە تێکەیشتوون کە سەرلێشێواندنێکم خولقاندووە. ئەوە کێ بوو کە بانگم کرد "تۆ"؟ هۆکوس-پۆکوس[1]! گۆشەنووسە پیرەکەتان بەهێواشی باس لە حافیزە ونبووەکەی دەکات؛ ئێوەش فەرموو وەرن، لەگەڵ مندا پێکەوە با بۆنی گوڵە سیسبووەکانی ناو باخەکەم بکەین، تێدەگەن. بەڵام زۆر مەیەنە ناویەوە، دوو هەنگاو لە دوورەوە بوەستن بزانم، بۆ ئەوەی نهێنیی فێڵی نووسینەکەم ئاشکرا نەبێت، بەئارامی و ئاسوودەیی بنووسم.

یەکسەر بۆتان باس دەکەم، نزیکەی سی ساڵ پێش ئێستا، لە یەکەم ساڵەکانی کاری ڕۆژنامەنووسیمدا، کاتێک هەواڵنێر بووم لە بەیۆغلو، دەرگابەدەرگا دەگەڕام و هەوڵم دەدا هەواڵێکم دەست بکەوێت. لە پاڤیۆنەکان و لەناو بازرگانەکانی مادده هۆشبەرەکان و چەتەکاندا دەگەڕام بۆ ئەوەی بزانم پیاوکوشتنێکی نوێ، یاخود چیرۆکی عەشقێک هەیە، کە بە خۆکوشتن کۆتاییی هاتبێت، هۆتێل بە هۆتێل دەگەڕام، بۆ ئەوەی بزانم کە بیانییەکی بەناوبانگ هاتووە بۆ ئیستانبوڵ، یاخود ڕۆژئاواییەکی سەرنجڕاکیش سەردانی شارەکەمانی

---

١ هۆکوس-پۆکوس، دوو وشەن کە جادووگەرەکان لە کاتی نمایشدا بەکاری دەهێنن.

کردووە، کە بتوانم وەک بیانییەکی بەناوبانگ پێشکەشی خوێنەرەکانمی بکەم، مانگی جارێک دەفتەری تۆمارکراوەکانم لە کاتبەکانی پرسگە وەر دەگرت، یەک دوونیویم دەخستە دەستیانەوە (بە واتای پارە) دەمخوێندنەوە. ئەو دەمانە دنیا وەک ئێستا پڕ نەبوو لە کەسانی بەناوبانگ؛ هیچیەکێکیان نەدەهاتن بۆ ئیستانبوڵ. ئەوانەی لە ڕۆژنامەکەمدا وەک بەناوبانگێک ناساندوومن، لەگەڵ ئەوەشدا لە وڵاتەکانی خۆیاندا هیچ نەدەناسران، کاتێک وێنەکەی خۆیان لەناو ڕۆژنامەکەدا دەبینی، کەوتوونەتە ناو چیرۆکێکەوە کە هەموو کات کۆتاییەکەی بێوەفایی بووە. یەکێک لەنێوانیاندا بەڕاستی دوای چەندەها ساڵ لە وڵاتەکەیدا گەیشتە ئەو شان و ناوبانگەی کە لە ڕۆژنامەکەمدا پێشبینیم کردبوو: دوای تێپەڕبوونی بیست ساڵ بەسەر نووسینی هەواڵێکم لەبارەی فلان ژنی بەناوبانگی مۆدەچییەوە کە دوێنێ لە شارەکەمان بوو، بەڕاستی بوو بە مۆدەچییەکی بەناوبانگی فەرەنسی– ئێگزیستانسیالیت، بەڵام سوپاسێکیشی نەکردم: ڕۆژئاواییی سپڵە.

تا لە یەکێک لەو ڕۆژانەی سەرقاڵی بەناوبانگە بێوەفاکان و چەتە خۆماڵییەکان - ئێستا بەمانە دەڵێن مافیا - بووم، لەگەڵ دەرماننناسێکی پیردا یەکتریمان ناسی کە لەوانە بوو ببووایە بە هەواڵێکی سەیر. ئەم پیاوە تووشی هەردوو نەخۆشیی بێخەوی و بیرچوونەوە ببوو، کە ئێستا من دەناڵێنم بەدەستیانەوە. ئەم دوو نەخۆشییە کاتێک بەیەکەوە تووشت دەبن، لایەنێکی ترسناکی هەیە، ئەویش ئەوەیە، کاتێک وا دەزانیت کە بە یەکێکیان - کاتێکی زۆر بە هۆی

بێخەوییەوە - ئەوی تریان - کەموکورتییەکانی یادگە - ناهێڵێت، ڕێک پێچەوانەی ئەمەیە: لە شەوانی بێخەویدا، ڕێک وەک من، یادەکان بە شێوەیەکی وەها ڕادەکەن لە پیرەکە، پیاوەکە لە ناوەڕاستی کات و شەودا کە بە هیچ شێوەیەک تێنەپەڕیون، بە شێوەیەک هەستی کردووە کە لە دنیایەکی بێناسنامە و بێکەسیتی و بێبۆن و بێڕەنگدا، بە تاقی تەنهایە لە ڕووی ئەودیوی مانگدا، کە لەو زەمانەدا لە گۆڤارە بیانییە وەرگێڕدراوەکاندا زۆر باسی لێوە دەکرا.

هەروەها پیرەکە لەجیاتیی ئەوەی وەک من نەخۆشییەکەی بە نووسین چارەسەر بکات، لە تاقیگەی دەرمانخانەکەیدا دەرمانێکی داهێنابوو. لە کۆبوونەوەیەکی ڕۆژنامەوانیی دووکەسیدا هەواڵنێرێکی ئەسرارکێشیش[1] لە ڕۆژنامەی *ئاکشەم*ەوە بەشداریی کرد لەگەڵ مندا - لەگەڵ دەرماننناسەکەدا دەبووین بە سێ کەس - دوای ئەوەی بەخۆدەرخستنەوە پەرداخێکی لە شلەمەنییە ڕەنگ پەمەییەکە پڕ کرد و خواردیەوە، کە لەو شووشەیەدا بوو بە دیدی خەڵکی دەناساند، بەڕاستی گەیشتبوو بەو خەوەی کە چەندەها ساڵ بوو بۆی دەگەڕا. هەر کە هێندەی خەوەکەیشی شاد بووەوە بە بەهەشتی یادەوەرییەکانی حافیزەی، لەبەر ئەوەی دەرماننناسە پیرەکە هیچ خەبەری نەبووەوە، خەڵک کە ئیتر کەوتبووە ناو جۆشوخرۆشی ئەوەی لە کۆتاییدا تورکێک توانیی داهێنان بکات، هیچ بۆیان ڕوون نەبووەوە، ئەنجامەکەیان نەزانی.

شایەد دوای دوو ڕۆژ و لە ڕۆژێکی ڕەشدا، کە چووین

---

١ ئەسرار: ماددەی هۆشبەرە

بۆ پرسەکەی، بەردەوام بیرم کردبووەوە ئەو شتەی کە دەیویست بیری بکەویتەوە، چی بوو. تاکو ئێستاش هەر بیری لێ دەکەمەوە: کاتێک پیر دەبین، ئەو قورساییانەی کە حافیزەمان فڕێیان دەدات، وەک ئاژەڵێکی بارهەڵگری نائاسوودە کە نایەوێت باری زیاد هەڵبگرێت، ئەو بارانەن کە هیچ خۆشی ناوێت، یان بارە هەرە قورسەکانە، یاخود ئەو بارانەن کە بەئاسانی دەکەون؟

فەوزاکەی مێشکم وای کردووە بیرم چۆتەوە ئەو ڕووناکیی خۆرەی کە لەنێوان پەردە تەنکەکانی ژوورە بچووکەکانی جوانترین گۆشەی ئیستانبوڵەوە دەڕژان، چۆن لە جەستەمانی دەدا. بیرم چۆتەوە کام سینەما بوو کە بلیتفرۆشێک لە دەرگاکەیدا بە قاچاغی بە نرخێکی زیاد بلیتی دەفرۆشت، دواتر لەبەر ئەوەی عاشقی کچە ڕوومەتلاوازە بلیتفرۆشەکەی ناو دەروازی سینەماکە بوو، شێت بوو. دەمێکە ناوی ئەو خوێنەرە خۆشەویستانەم بیر چۆتەوە کە هاوشێوەی خەوەکانی منیان دەبینی، کاتێک خەوەکانتانم شی دەکردەوە بۆ ڕۆژنامەکەتان و ئەو نهێنییانەی کە بە نامە بۆم دەناردن.

یەتەوە یادم، دوای چەندەها ساڵ، گۆشەنووسەکەمان، کاتێک سەرلەنوێ سەیری ئەو زەمانە ونبووە دەکات، کاتێک لە نیوەی شەودا لەناو بێخەویدا دەگەڕێت بۆ ئەوەی چارەیەک بدۆزێتەوە، بیر لە ڕۆژێکی ترسناک دەکاتەوە کە لە کۆڵانەکانی ئیستانبوڵدا ژیاوە: جارێکیان کەوتبوومە ناو ویستی ماچێکەوە کە سەراپا هەموو جەستەم، هەموو ڕۆحمی داپۆشیبوو.

کاتێـک لـە دوانیوەڕۆیەکـی ڕۆژی شـەممەدا، لـە یەکێـک لـە سـینەما کۆنەکانـدا سـەیری فیلمێکـی ئەمەریکیـی پۆلیسـی نهێنیـم دەکـرد (لاییتـی سـوور) بڕگـەی ماچکردنێکـم بینیبـوو، کـە زۆری نەخایاندبـوو. ئـەم بڕگـەی ماچـە ئاسـاییە لەلایـەن سانسـۆرچییەکانی خۆمانـەوە چـوار سـانییە زیاتـری لـێ بڕابـوو، کـە جیـاوازی نەبـوو لەگـەڵ بڕگـەی ماچەکانـی تـری فیلمـە ڕەشوسـپییەکاندا، بـەڵام نازانـم چـۆن ڕووی دابـوو، لـە ناخمـدا ویسـتی ماچێکـی وەهـا سـەری هەڵـدا کـە بـە هەمـان شـێوە لەگەڵ ژنێکدا بـە نووسـاندنی لێوەکانـم بـە لێوەکانیـدا، بەڵـێ بـە هەمـوو هێـزم بـە نووسـاندنی لێوەکانـم بـە لێوەکانیـدا ماچـی بکـەم، لـە دڵتەنگیـدا وام دەزانـی دەخنکێـم. تەمەنـم بیسـتوچوار سـاڵ بـوو، بـەڵام هێشـتا لەگـەڵ کەسـدا لێوبەلێـو ماچـم نەکردبـوو. نەخێـر، ئـەوە نەبـێ بڵێـم لـە شـوێنی لەشفرۆشـاندا لەگـەڵ هیـچ ژنێـک نەخەوتـووم، بـەڵام هـەر وەک چـۆن ئـەو ژنانـە ماچومـووچ ناکـەن، منیـش نەمدەویسـت ماچـی لێـوی ئـەوان بکـەم.

یەکسـەر چوومـە سـەر شـەقامەکە، بـەڵام هێشـتا فیلمەکـە تـەواو نەببـوو؛ بێسـەبری و شـڵەژاوییەک لـە ناخمـدا بـوو، وەک بڵێـی لـە شـوێنێکی شـاردا ژنێـک چاوەڕێـی منـە، دەیەوێـت ئـەم ماچـەم لەگەڵـدا بـکات. بیرمـە وەک بڵێـی ڕابکـەم. چـووم بـۆ تونێلەکـە[1]، دواتـر بـە پێچەوانـەوە بەخێرایـی گەڕامـەوە بـۆ گەلاتەسـەرای[2]، وەک بڵێـی بەنائومێدییـەوە لـە تاریکاییـدا بـۆ شـتێک بگەڕێـم، کارم دەکـرد بـۆ ئـەوەی خەیاڵـی ژنێـک،

١ تونێل: ئەو تونێلەیە کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی جادەی ئیستیقلال لە تەقسیم.

٢ گالاتاسـەرای: دەکەوێتە ناوەڕاستی جادەی ئیستیقلالەوە، کە لە هەمان شوێندا ئامادەیی گەلاتەسەراشی لێیە، لە بەری ئەورووپای ئیستانبوڵ.

یادی سیمای، پێکەنینێکی بدۆزمەوە. هیچ ناسیاو و خزمێکم نەبوو کە بتوانم ماچی بکەم؛ هیچ ئومێدی دۆزینەوەی خۆشەویستێکیش نەبوو؛ هیچ کەسێکیشم نەدەناسی کە ببێت بە خۆشەویستم! وەک بڵێی شارە قەرەباڵغەکە، چۆڵوهۆڵ بوو.

هەر کە هاتمە تەقسیم، خۆمم لەناو پاسێکدا بینییەوە. خێزانێکی خزمی دووری دایکم هەبوو کە لەو ساڵانەی باوکم ئێمەی جێ هێشت هاوکاریی ئێمەی دەکرد؛ کچێکیان هەبوو کە دوو ساڵ لە من بچووکتر بوو، ئەو سەردەمە چەند جارێک پێکەوە یاریی تۆبەردیمان کردبوو. دوای کاتژمێرێک، کاتێک گەیشتمە ماڵەکەی فندقزادەیان[1]، تاکو لە دەرگاکەیانم دا، بیرم کەوتەوە ئەو کچەی من بیر لە ماچکردنی دەکەمەوە لەمێژە هاوسەرگیریی کردووە. باوک و دایکی کە ئەمڕۆ هەردووکیان بەڕەحمەت بوون فەرموویان لێ کردم بۆ ژوورەوە. کەمێک سەرسام ببوون، تێنەگەیشتبوون بۆچی دوای چەندەها ساڵ سەردانم کردبوون. بە گفتوگۆکردن و بە قسەکردن لەبارەی فلان و فیسار شتەوە، هەتا ڕۆژنامەنووسیم سەرنجی ڕانەدەکێشان: ئەمە بەنیسبەت ئەوانەوە ئیشێکی ئاست نزم بوو، وەک زەموزەمکاری، بە گوێگرتن لە یاریی تۆپی پێکەی ناو ڕادیۆکەوە چامان خواردەوە، سمیتمان خوارد. بە نیەتێکی باشەوە چاوەڕوانیان دەکرد بۆ نانخواردنی ئێوارەش بمێنمەوە، بەڵام لەناکاو بە ورتەورتکردنەوە خۆم هەڵدایە دەرەوە.

سەرم گەرم ببوو، کاتێک چوومە دەرەوە، هەستم بە

---

١ فندقزادە: گەڕەکێکە لە ئیستانبول لە بەری ئەورووپا.

هەوا ساردەکە کرد، هێشتا ویستی ماچکردن لە ناخمدا بەکڵپە دەسووتا: وەک بڵێی پێستم وەک سەهۆڵ بوو، بەڵام لەبەر ئەوەی گۆشت و خوێنم لەناو ئاگردا بوو، هەستم بە نائاسوودەییەکی قووڵ و بەرگەنەگیراو دەکرد. لە ئەمینونووە[1] سواری پاپۆڕ بووم و چووم بۆ قادی کوێی[2]. هاوڕێیەکی ئامادەییم هەبوو کە باسی سەرکێشییەکانی کچە (واتە کچێک کە پێش ئەوەی هاوسەرگیری بکات ماچی دەکرد) ماچکەرەکەی گەڕەکەکەیانی دەکرد، کاتێک ڕێم دەکرد بۆ ماڵەکەیان لە فەنەرباخچە[3]، بیرم دەکردەوە، ئەگەر ئەو کچەش نەبێت، هاوڕێکەم کەسانی تری وەک ئەو شک دەبات. لەو شوێنەدا کە هاوڕێکەم سەردەمێک بوو تێیدا نیشتەجێ بوو، بە هەرچوار دەوری درەختە سەرڤییەکان و کۆشکە لەتەختەدروستکراوە تاریکەکاندا سووڕامەوە، بەڵام ماڵەکەیم نەدۆزییەوە. کاتێک لەنێوان ئەو کۆشکە تەختانەدا ڕێم دەکرد، کە ئەمڕۆ دەمێکە هەموویان ڕووخێنراون، سەیری هەندێک پەنجەرەی ڕووناکم دەکرد، بیرم دەکردەوە ئەو کچەی کە پێش هاوسەرگیریکردن ماچ دەکات لەوێدا نیشتەجێیە. بە سەیرکردنی پەنجەرەیەکەوە دەمووت، "ئەوەتا، ئەو کچەی پێکەوە ماچی یەک دەکەین لەوێیە!" لەنێوانماندا دوورییەکی ئەوتۆ نەبوو، تەنها دیواری باخێک و دەرگا و پلیکانەی تەختە نەبێت، بەڵام نەمدەتوانی پێی بگەم؛ نەمدەتوانی ماچی بکەم؛ ئەو شتە نهێنیدارە سەیرە باوەڕپێنەکراوەی هێندەی

---

١ ئەمینونو: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئەورووپا لە کەنار دەریادا.
٢ قادی کوێی: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئاسیا لە کەنار دەریادا.
٣ فەنەرباخچە: گەڕەکێکە لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئاسیا.

خەونەکان نامۆ و ئەفسووناوی بوو، ئەو شتە ترسناک و سەرنجڕاکێشە، لەو ساتەدا چەند نزیک و چەندە دوور بوو!

هەر کە دووبارە گەڕامەوە بەری ئەورووپا، بیرمە، بیرم لەوە کردبووەوە بلێی چی ببێت ئەگەر یەکێک لەو ژنانە بەزۆر ماچ بکەم کە لە پاپۆڕەکەدا ڕێکەوتیان دەکەم، یاخود بە شێوەیەک هەڵسوکەوت بکەم کە هەڵەیەک بووبێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەی کەسێک نیم کە زۆر ورد ببمەوە، سیمایەکی وەهام لە دەوروبەرمدا نەدەبینی. لە سەردەمانێکی تری ژینمدا، کاتێک هەناسەم دەدا لەناو قەرەباڵغیی ئیستانبوڵدا، چەند جارێکی تریش بەنائومێدی و ئازارەوە کەوتومەتە ناو هەستی ئەوەی شار چۆڵە، چۆڵوهۆڵە، بەڵام هیچ کاتێک وەک ئەو ڕۆژە بەقووڵی هەستم بەو هەستە نەکردبوو.

دوای ماوەیەکی زۆر ڕێکردنم بەسەر پلیکانە شێدارەکاندا، بیرم کردەوە. بۆ ئەوەی لەم شارە چۆڵوهۆڵەدا ئەوە بەدەست بهێنم کە دەمەوێت، هەڵبەتە کاتێکی تر، بە شانوشکۆ و ناوبانگەوە دەهاتم. بەڵام لەو ساتەدا گۆشەنووسەکەتان دەچووەوە بۆ ئەوماڵەی کە لەگەڵ دایکیدا تێیدا نیشتەجێ بوو، جگە لە خوێندنەوەی ڕاستیناکە (قارەمانی ناو کتێبێکی بەلزاکە) بەدبەختەکەی بەلزاک بە وەرگێڕانە تورکییەکەی، ئیتر هیچ دڵنەواییەکی تری نەبوو. بەڵام ئەو سەردەمە کتێبەکانم لەبەر ئارەزووی خۆم نەدەخوێندەوە، ڕێک وەک تورکێک بە هەستی ئەرکەوە دەمخوێندنەوە کە لە داهاتوودا شتێکن سوودیان دەبێت بۆم. ئەو شتەی کە لە داهاتوودا سوودی دەبێت، ئێستا بە هیچ شێوەیەک ڕزگارم ناکات! بەو شێوەیەش کەمێک دوای ئەوەی خۆم توندی ژوورەوە

کرد، لەناو بێسەبریدا چوومە دەرەوە. سەیری ئاوێنەی گەرماوەکەم کرد، دێتەوە یادم، بیرم کردبووەوە کە هیچ نەبێت مرۆڤ دەتوانێت ماچی خۆی بکات، کاتێک سەیری ئاوێنەکەم کردبوو، ئەکتەرەکانی ناو فیلمەکەم هێنابووە بەر چاوی خۆم.

ونبوونی لێوەکانی ئەو ئەکتەرانە لە بەرچاومدا ئەستەم بوو، (هووان بەننەت، دان دوریە). بەڵام نەک هەر خۆم، بەڵکو بەتەنها دەمتوانی ئاوێنەکە ماچ بکەم؛ لەبەر ئەوە چوومە دەرەوە. دایکم لەسەر کورسیی بەردەمی مێزەکە دانیشتبوو، لەنێوان پارچەقوماشی شیفۆن و قاڵبەکانیدا کە کێ دەزانێت لە کام خزمی دەوڵەمەندی خزمە دوورەکانی وەر گرتبوو، جلی شەوی بۆ شاییەک ئامادە دەکرد.

ساتێک سەیری دایکم کرد، دواتر دەستم کرد بە باسکردنی هەندێک شت بۆی. ئەو شتانەی کە لە داهاتوودا دەیکەم، وا بزانم ئەمانە ئەو چیرۆک و خەیاڵانە بوو کە بانگەشەی سەرکەوتنەکان و خەیاڵەکانمی دەکرد، بەڵام دایکم لە دڵەوە گوێی لێ نەدەگرتم. تێگەیشتم هەرچییەکی بۆ باس بکەم گرنگ نەبوو بەلایەوە؛ ئەوەی گرنگ بوو، ئەوە بوو کە شەوێکی شەممە لەگەڵ دایکمدا دانیشم، هاوڕێیەتی بکەم. هەستم بە تووڕەییەک کرد لە خۆمدا. دایکم ئەو شەوە لەبەر هەر هۆیەک بێت جوان بوو، قژی داهێنراو و بۆیەیەکی کاڵی لە لێوەکانی دابوو؛ تا ئێستاش ڕەنگی بۆیەکەی لێویم بیرە، سوورێکی کرمیتی بوو. کاتێک سەیری لێوەکانی دایکم و دەمیم دەکرد، کە هەموو جارێک دەوروبەرمان دەمیان لە دەمی من دەچوواند، حەپەسابووم.

یەکسەر بەترسەوە وتی، "بۆچی بەو شێوە سەیرە سەیرم دەکەیت؟"

وەک بڵێی بۆ ماوەیەکی زۆر بێدەنگییەک ڕووی دا. بەرەو ڕووی دایکم ڕێم کرد، بەڵام دوای دوو هەنگاو وەستام، قاچەکانم دەلەرزین. بێ ئەوەی زیاتر نزیک ببمەوە، بە هەموو هێزم دەستم کردبوو بە هاوارکردن. ئێستا بە ڕوونی بیرم ناکەوێتەوە کە چیم وتبوو، بەڵام یەکسەر یەکێک لەو شەڕە ترسناکانە دەستی پێ کردبوو کە زووزوو لەنێوانماندا ڕووی دەدا. بۆ ساتێک ترسی گوێگرتنی دراوسێکان لە دڵی هەردووکماندا نەمابوو. یەکێک بوو لەو ساتە تووڕەیی و ئازادییانەی کە مرۆڤ هەموو شتێک بە بەرامبەرەکەی دەڵێت، لەم جۆرە بارانەدا وەک بڵێی فنجانێک دەشکێت، یاخود وەک بڵێی زۆپاکە دەکەوێت بە لادا.

بە شێوەیەکی ئەستەم خۆم هەڵدایە دەرەوە، دایکم لەنێوان پارچەقوماشە شیفۆن و بەکرەکان و دەرزییە سەرخڕە هاوردەکاندا دەگریا (یەکەم دەرزیی سەرخڕی تورکی لە ساڵی ١٩٧٦دا لەلایەن کارگەی ئاڵتییەوە دروست کراوە). تاکو نیوەی شەو لە کۆڵانەکانی شاردا گەڕام. چوومە حەوشەی مزگەوتی سولەیمانییەوە، لە پردەکەی ئەتاتورکەوە تێپەڕ بووم، چووم بۆ بەیئۆغڵو. وەک بڵێی من، من نەبووم؛ وەک بڵێی ڕۆحێکی تۆڵە، تووڕە، شوێنم کەوتبوو؛ وەک بڵێی ئەو کەسەی پێویست بوو من بوومایە، بەشوێنمەوە بوو.

یادمە لە بەیئۆغڵو لە مەحەلەبیخانەیەکدا دانیشتم؛ بەتەنها بۆ ئەوەی لەناو قەرەباڵغیدا بم؛ بەڵام سەیری کەسیشم نەدەکرد، نەوەک چاوم بکەوێتە سەر چاوی کەسێک کە وەک

من هەوڵ دەدات بۆ بەسەربردنی ئەو کاتژمێرە بێکۆتایانەی شەوی شەممە، چونکە ئەو کەسانەی کە وەک منن، یەکسەر یەکتری دەناسن، یەکتری نزم دەکەنەوە. پاش کەمێکی تر، ژن و مێردێک نزیک بوونەوە لێم. پیاوەکە دەستی کرد بە گێڕانەوەی چەند شتێک. ئەم تارماییە قژسپییەی ناو یادگارییەکانم کێ بوو؟

نەمدەزانی کێیە، دواتر بیرم کەوتەوە ئەو هاوڕێ کۆنەم بوو کە بە هیچ شێوەیەکماڵەکەیم نەدۆزیبووەوە لە فەنەرباخچە. هاوسەرگیریی کردبوو و لە ڕێگەی ئاسنینی دەوڵەتدا کاری دەکرد، هەر لە ئێستاوە قژی سپی ببوو، ئەو ساڵانەشی زۆر باش دەهاتەوە یاد. هەندێک جار کاتێک دوای چەندەها ساڵ ڕێکەوتی هاوڕێیەکی کۆنت دەکەیت، بۆ ئەوەی ڕابردووی خۆی بە شێوەیەکی سەیر پیشانی ژنەکەی یاخود ناسیاوەکەی تەنیشتی بدات، ئێوە زۆر بە سەیر دادەنێت، بە شێوەیەک هەڵسوکەوت دەکات وەک بڵێی چەندەها یادگاری و نهێنیی هاوبەشتان هەیە، بۆ ئەوەی سەرسامت بکات، ئەویش بەرامبەر من هەمان هەڵسوکەوتی کرد، بەڵام من سەرسام نەبووم. نەچوومە ناو ئەو نواندنەی کە بەتەنها یادگارییە خەیاڵییەکان سەیرتر دەکات، نەچوومە ناو یاریی ئەوەی کە هێشتا لەو ژیانە سەفیل و بەئازارەی ڕابردوودا دەژیم، کە ئەو لە ڕابردوودا جێی هێشتووە.

جارجارێک کەوچکم لە محەلەبییە بێشەکرەکەم دەدا، دواتر دانم پێدا نا کە لەمێژە هاوسەرگیریم کردووە، لە نیشانتاشی[١] نیشتەجێین، پارەیەکی زۆرم دەست دەکەوێت،

---

١ نیشانتاشی: گەڕەکێکە لە ئیستانبول، لە بەری ئەورووپا.

لـە ماڵـەوە تـۆ چاوەڕوانـی منیـت، لەسـەر داخـوازی و نـازی تـۆ هاتـووم بـۆ ئێـرە بـۆ ئـەوەی شـیرینیی سـنگی مریشـکت[1] بـۆ بکـڕم، ئوتومبێلـە شۆفرلێتەکەشـمم لـە تەقسـیم ڕاگرتـووە، دەتوانـم بـە ئوتومبێلەکـەم ئـەوان لەسـەر ڕێگەکـەم لـە شـوێنێکدا دابـبەزێنـم. سوپاسـی کـردم، چونکـە تاکـو ئێسـتاش هـەر لـە فەنەرباخچـە نیشـتەجێ بـوو. کاتێـک زانیشـی کـە تـۆ، "لـە خێزانێکی باشیت." سـەرەتا بەشـەرمەوە و دواتـر بـۆ ئـەوەی بۆ ژنەکـەی بسـەلمێنێت کـە نێوانـی لەگـەڵ خێزانـە باشـەکاندا زۆر باشـە، دەسـتی کـرد بـە پرسیارکردنت، هەڵەکـەم لەدەسـت نـەدا، پێـم وت کـە پێویسـتە تـۆی بیـر بکەوێتـەوە. بەئاسـوودەییەوە بیری کەوتـەوە. لـە ناخـەوە سـڵاو و ڕێـزی بـۆ ناردیـت. کاتێـک بـەو پاکەتـەی دەسـتمەوە کـە شـیرینیی سـنگی مریشـکەکەی تێـدا بـوو لـە موحەلەبیخانەکـە هاتمـە دەرەوە، لەپێشـدا ئـەوم مـاچ کـرد، دواتـر بـە هـەوایەکـی ناسـکی ڕۆژئاوایییـەوە کـە لـە فیلمەکانـەوە فێـری دەبیـت، ماچـی ژنەکەیشـیم کـرد. ئێـوە چەنـد خوێنەرێکـی سـەیرن، ئێـرە چەنـد وڵاتێکـی سـەیرە!

---

[1] سنگی مریشـک: شیرینییەکە کە لە موحەلەبییەکی کەمێک تونـد دەچێت و پارچـەی وردی سـنگی مریشکی تێدایە.

# دوکانەکەی عەلادین

**[لە کتێبی *ڕەشـــەوە*. جەلال سالیکی ڕۆژنامەنووس، باس لە دوکانێکی نیشانتاشی دەکات لە ساڵی ١٩٨٠دا.]**

مـن نووسـەرێکی پیتۆریکسـم[١]. سـەیری فەرهەنگەکانـم کـرد، بـەلام زۆر لـە واتـای ئـەم وشـەیە تێنەگەیشـتم؛ مـن تەنهـا هەواکەیـم خـۆش دەوێـت. هەمـوو کات بیـرم لـەوە کردۆتـەوە کـە شـتی جیـاواز بگێڕمـەوە: شـەش جەنـگاوەرە چەکدارەکـە. سـوپاکانی پێـش سـێ سـەد سـاڵ کـە لـە بەیانییەکـی تەماویـدا لـە هـەردوو سـەری دەشـتێکی تاریکـدا خۆیـان ئامـادە دەکـەن بـۆ ئـەوەی پەلامـاری یەکتـر بـدەن. ئـەو نائاسـوودانەی کـە لـە شـەوانی زسـتاندا لـە مەیخانەکانـدا چیرۆکـی عەشـقەکانیان بـۆ یەکتـری دەگێڕنـەوە. هەمـوو کات بیـرم لـە گێڕانـەوەی سەرکێشییە لەبنەهاتووەکانی ئـەو عاشقانە دەکردەوە کـە بـە هـۆی گـەڕان بـەدوای نهێنییەکـەوە، لەنـاو تاریکاییـی شـارەکاندا

١ پیتۆریکس: واتـە دیمەنێک کـە گونجاوە بـۆ بابەتی نـاو وێنـە. دیمەنێکی ناوازەیـە کـە لەگـەڵ بەسـەرچوونی زەمانێکـی زۆردا دێتـە مەیدانـەوە، بـێ ئـەوەی نـۆژەن بکرێتـەوە.

ون دەبن، بەلام خوا بەتەنها ئێوەی خوێنەری دا بە من لەم گۆشەی ڕۆژنامەیەدا کە پێویست بوو چیرۆکی چەشنی جیاوازتری تێدا بگێڕمەوە. پێکەوە ئیدارە دەکەین.

ئەگەر باخی حافیزەم دەستی نەکردایە بە وشکبوون، لەوانە بوو هیچ سکالام لەم بارەم نەکردایە، بەلام هەموو جارێک کە قەڵەمەکەم دەگرم بە دەستمەوە دووبارە سیمای ئێوەی خوێنەر کە چاوەڕێی شتێکن لێم، نیشانەی یادگارییەکانم کە لە باخێکی وشکدا هەمووی یەک یەک لە من ڕادەکەن لە بەرچاومدا زیندوو دەبنەوە. لە جێی یادگاری، بەتەنها ڕووبەڕووبوونەوەی نیشانەیەکی، لەوە دەچێت بەگریانەوە سەیری ئەو نیشانەیە بکەیت کە خۆشەویستەکەت لەسەر قەنەفەکە جێی هێشتووە، کاتێک دەستبەرداری ئێوە دەبێت و دەڕوات و قەت ناگەڕێتەوە.

بەو شێوەیە بڕیارم دا کە لەگەڵ عەلادیندا گفتوگۆ بکەم. هەر کە زانیی لە ڕۆژنامەکەدا باس لە خۆی دەکەم، بەلام لەپێشدا دەمەوێت یەکتر ببینین و پێکەوە گفتوگۆ بکەین، چاوە ڕەشەکانی کردەوە و وتی، "کاکی گەورە، ئێستا ئەم نووسینە لە دژی من دەبێت؟"

بۆم باس کرد کە نووسینەکە دژ بەو نابێت. باسی دوکانەکەی نیشانتاشیم بۆ کرد کە لە ژیانماندا چەند شوێنێکی گرنگی هەیە. بۆم باس کرد کە ڕەنگ و بۆنی هەزارەها و دەیەها هەزار ئەو شمەکە هەمەچەشنانەی کە لە دوکانە بچکۆلەکەیدا دەیفرۆشێت لە حافیزەی هەموومانددا چۆن بەزیندوویی ماونەتەوە. بۆم باس کرد ئەو منداڵانەی لە ماڵەکانیاندا نەخۆشن و لە جێگەکەیاندا کەوتوون، چۆن

بەبێسەبری چاوەڕوانی گەڕانەوەی دایکیان دەکەن کە چووە بۆ دوکانەکەی عەلادین بۆ هێنانی دیاری و یاریچە (سەربازی تەقەکەر)، یاخود کتێب (*مندالـە قژسـوورەکە*) یاخود ڕۆمانی وێنەدار (*حەڤدەهەمین ژمارەی زیندووبوونەوەی کینۆڤا*). بۆم باس کرد لە قوتابخانەکانی چواردەوردا هەزارەها قوتابی کە چاوەڕوانی لێدانی دوایین جەرەسن، دوای لێدانی ئەو جەرەسەی کە لە خەیاڵیاندا لەمێژە لێیان داوە، لە خەیاڵیاندا چۆن چوونەتە ئەو دوکانە و تێیدا یاریزانی تۆپی پێ (مەتینی یاریزانی تیپی گەلاتەسەرای)، زۆرانباز (حەمیدا کەپلان)، یاخود لەو گۆفرێتانەیان دەکڕی کە وێنەی هونەرمەندی فیلمیی (جێری لویس) تێدا دەر دەچوو. بۆم باس کرد کە ئەو کچانەی پێش ئەوەی شەو بچن بۆ قوتابخانەی هونەری، شووشەیەکی بچووکی ئەسیتۆنیان دەکڕی، بۆ ئەوەی بۆیە کاڵبووەوەکەی نینۆکیان لێ بکەنەوە، دوای چەندەها ساڵ لە موبەقێکی وشکی هاوسەرگیرییەکی وشکدا لەنێوان کچەزا و کوڕەزاکانیاندا، کاتێک بەخەمبارییەوە بیری یەکەم عەشقی گەنجێتییان دەکەنەوە، چۆن بیر لە دوکانەکەی عەلادین دەکەنەوە وەک ئەفسانەیەکی دوور.

دەمێک بوو هاتبوو بۆ ماڵی ئێمە، ڕووبەڕووی یەکتر دانیشتبووین. بۆم باس کرد کە چەندەها ساڵ لەمەوبەر لە دوکانەکەی عەلادیندا قەڵەمجافێکی سەوزم کڕیوە، چیرۆکی ڕۆمانێکی پۆلیسیی خراپوەرگێڕدراوم بۆ گێڕایەوە، کە ئەویشم لە دوکانەکەی ئەودا کڕیبوو: لە کۆتاییی دووهەم چیرۆکدا، ئەو قارەمانەی کە زۆر خۆشم دەویست و کتێبەکەم دابوویە بە دیاری، تاکو کۆتاییی ژیانی مەحکوم

بوو بەوەی کە جگە لە خوێندنەوەی ئەو ڕۆمانە پۆلیسییانە هیچ شتێکی تر نەکات. بۆم باس کرد کە سەربازە پلەدارە نیشتیمانپەروەرەکان لەگەڵ ڕۆژنامەوانەکاندا کە پلانی کودەتای دەوڵەتیان دەکێشا کە هەم مێژووی ئێمە، هەم مێژووی هەموو ڕۆژهەڵاتی دەگۆڕی، پێش یەکەم کۆبوونەوە مێژووییەکەیان، چۆن لە دوکانەکەی عەلادیندا یەکترییان بینیوە. بۆم باس کرد کە شەوێکیان کاتێک ئەم یەکتربینینە مێژووییە ڕووی دا، عەلادین کە ئاگاداری هیچ شتێک نەبوو، لەپشتی ئەو مێزەوە کە تاکو سەقفەکە بە کتێب و قوتووی هەڵچنراو داپۆشرابوو، چۆن تفی داوە لە پەنجەکانی بۆ ئەوەی ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە بژمێرێت کە ڕۆژی دوایی دەیانگەڕێنێتەوە. بۆم باس کرد ئەو کوڕە زوگوردییانەی بەخەیاڵڕۆیشتنەوە بەسەر شۆستەی بەردەمی دوکانەکەدا دەڕۆن و وێنەی ئەو ژنە ڕووتە بیانی و ناوخۆییانەی ناو گۆڤارەکان دەبینن کە هەڵی واسیوە بە جامخانەکە و قەدە ئەستورەکەی درەختە کەستانەکەی بەردەمی دەرگاکەیدا و نماییشی کردوون، لەناو ئەو خەوەدا کە ئەو شەوە دەیبینن، بێ گوێدان بە هیچ شتێک ڕادەبوێرن، ڕێک وەکو کچە دیلەکان و ژنی پاشاکانی ناو ئەفسانەکانی *هەزار و یەک شەوە* کە بە هیچ شێوەیەک تێر نابن. لەبەر ئەوەی باسی ئەفسانەکانی *هەزار و یەک شەوە*مان کرد، بۆم باس کرد ئەو چیرۆکەی کە ناوی کتێبەکەی هەڵگرتووە، لە ڕاستیدا لە هیچ یەکێک لە هەزار و یەکشەوەکەدا نەگێڕدراوەتەوە، بەڵام کاتێک کتێبەکە دوو سەد و پەنجا ساڵ پێش ئێستا بۆ یەکەم جار لە ڕۆژئاوا بڵاو کراوەتەوە، لەلایەن ئەنتۆین گالاندەوە

بە شێوەیەکی خێرا بە دەستە لێهاتووەکانی خنیویەتیە نێوان پەڕەکانیەوە. بۆم باس کرد کە لە ڕاستیدا چیرۆکەکە نەک شەهرەزاد، بەڵکو کریستیانێک بە ناوی هاننناوە بۆ گالاندی گێڕاوەتەوە. بۆم باس کرد کە لە ڕاستیدا هاننا زانایەکی حەلەبییە بە ناوی یوحەننا دیابەوە، چیرۆکەکەی چیرۆکێکی تورکییە، ئەگەڕێکی گەورەی هەیە لە ئیستانبوڵدا ڕووی دابێت، ئەمەش بە هۆی بوونی قاوە لە چیرۆکەکەدا دەزانرێت. بۆم باس کرد، بەلام لە ڕاستیدا ئیتر مرۆڤ هیچ کاتێک ناتوانێت تێبگات کە کامەیان چیرۆکە ڕاستەقینەکەیە و کام ژیانە ڕاستەقینەیە. بۆم باس کرد، چونکە لە ڕاستیدا هەموو شتێکم بیر چۆتەوە، هەموو شتێکم بیر چۆتەوە، هەموو شتێکم بیر چۆتەوە. بۆم باس کرد، چونکە لە ڕاستیدا پیر، دڵتەنگ، بەدخوو و تەنهام، دەمەوێت بمرم. چونکە لە ڕاستیدا شەوان لە مەیدانی نیشانتاشەوە دەنگی ژاوەژاوی قەرەباڵغیی ئوتومبێل و دەنگی موزیکێکیش دەهات لە ڕادیۆکەوە کە مرۆڤی لەناو فرمێسکەکانیدا بەخەمەوە دەخنکاند. بۆم باس کرد، چونکە لە ڕاستیدا منیش دوای ئەوەی بە درێژاییی تەمەنم چیرۆکم گێڕاوەتەوە، دەمەوێت پێش ئەوەی بمرم گوێ لە عەلادین بگرم، بۆ ئەوەی هەموو چیرۆکی ئەو شتانەم یەک بە یەک بۆ بگێڕێتەوە کە بیرم چوونەتەوە، شووشە قوڵۆنیاکانی دوکانەکە، پوولەکانی مۆرکردن، وێنەی سەر شقارتەکان، گۆرەوییە نایلۆنەکان، پۆستکارتەکان، وێنەی هونەرمەندەکان، سالانەکانی سێکسۆلۆژی، تەوقەکان، کتێبی نوێژکردن.

عەلادینیش وەک هەموو ئەو کەسە ڕاستەقینانەی کە

کەوتوونەتە ناو چیرۆکە خەیاڵییەکانەوە، لایەنێکی سەروو راستیی هەبوو کە فشاری دەخستە سەر سنوورەکانی دنیا، لۆژیکێکی سادەشی هەبوو کە فشاری دەخستە سەر یاساکانی. رووونی کردەوە کە ئاسوودەیە رۆژنامەکان گرنگی بە دوکانەکەی دەدەن. سی ساڵە رۆژی چواردە کاتژمێر بەردەوام کار دەکات لە دوکانی سەرسووچەکەدا، دوانیوەروانی رۆژی یەکشەممان، کاتێک هەمووکەس لە رادیۆکەوە گوێ لە یاریی تۆپی پێ دەگرێت، لەماڵەوە لە کاتژمێر دوو و نیوەوە تاکو چوار و نیو دەخەوت. باسی کرد کە لە راستیدا ناوە راستەقینەکەی ناوێکی ترە، بەڵام مشتەرییەکانی ئەمە نازانن. باسی کرد کە بەتەنها رۆژنامەی حورپییەت دەخوێنێتەوە. باسی کرد کە رێ نادات هیچ یەکتربینینێکی سیاسی لە دوکانەکەیدا روو بدات، چونکە هیچ گرنگییەک بە سیاسەت نادات، قاراقۆڵی تەشفیکییەش رێک بەرامبەر دوکانەکەیەتی. ئەوەش راست نەبوو کە گوایا تفی داوە لە پەنجەی بۆ ئەوەی گۆڤارەکان بژمێرێت؛ دوکانەکەشی ئەفسانەیەک یاخود داستانێکە. سکالای لەم شێوە بەهەڵەداچوونانە بوو: هەندێک پیری هەژار سەعاتە پلاستیکەکانی ناو جامخانەکەیان بە سەعاتی راستی دەزانی، سەرسام دەبوون بە هەرزانییەکەی و بەجۆشوخرۆشەوە خۆیان دەکرد بەناو دوکانەکەدا. هەندێک لەو کەسانەی کە بیتاقەی یاریی پێشبڕکێی ئەسپیان دەکڕی لە هۆڵەکەدا و نەیاندەبردەوە، یاخود دووبارە کە هیچ شتێک دەر نەدەچوو لەو بیتاقەی یانسیبەی کە بە دەستی خۆیان هەڵیان بژاردووە، توورە دەبوو، دەنگەدەنگیان دەکرد، وایان دەزانی

کە عەلادین خۆی ئەم یارییانەی دروست کردووە. ئەو ژنەی کە گۆرەوییە نایلۆنەکەی هەڵدەوەشا، دایکی ئەو منداڵەی کە بە هۆی خواردنی چۆکۆلاتە خۆماڵییەکەوە هەموو پێستی پەڵەپەڵە ببوو و هەڵدەوەری، ئەو خوێنەرەی کە تێڕوانینی سیاسیی ناو ئەو ڕۆژنامەیەی بەدڵ نەبوو کە دەیخوێندەوە، لەجیاتیی بەرهەمهێنەرەکان تاوانبار بکەن، بەتەنها عەلادینیان تاوانبار دەکرد. عەلادین بەرپرسیار نەبوو لەو پاکەتەی کە لەجیاتیی قاوە بۆیەی قاوەییی پێڵاوی تێدا بوو. عەلادین بەرپرسیار نەبوو لەو پیلە خۆماڵییەی کە دوای یەکەم گۆرانیی ئەمەل سایین[1] بە لەرزەلەرزەوە شلەیەکی ڕەشی لێوە دەڕژا و ڕادیۆ ئەنتیگریتییەکەی خراپ دەکرد. عەلادین بەرپرسیار نەبوو لەو قیبلەنمایەی کە بۆ هەرشوێنێک بچوویتایە هەر ئاراستەی باکوور و قەرەقوڵەکەی تەشقیکییەی پیشان دەدات. عەلادین بەرپرسیاریش نەبوو لەو پاکەتی جگەرە بافرایەی کە لەناویدا نامەی عەشق و هاوسەرگیری کچە ئیشکەرەکەی تێدا دەر دەچوو، بەلام ئەو شاگردە بۆیاخچییەی کە پاکەتەکەی کردۆتەوە، بەدڵخۆشییەوە بەڕاکردن هاتووە و دەستی عەلادینی ماچ کردووە و داوای لێ کردووە کە ببێت بە شایەتی بۆ مارەیی، پرسیاری ناوی کچەکە و ئەدرێسەکەی کردووە.

دوکانەکەی لە گەڕەکێکدا بوو کە زەمانێک پێیان دەوت "باشترین" گەڕەک لە ئیستانبوڵدا، بەلام مشتەرییەکانی هەموو کات، هەموو کات ئەویان سەرسام دەکرد. سەرسام دەبوو بەو پیاوە بۆینباخلەملانەی کە تا ئێستاش نازانن شتێک هەیە

١ ئەمەل سایین: گۆرانیبێژێکی تورکییە.

ناوی سەرەیە، بەرگەی ئەوانەشی نەدەگرت کە سەرەڕای ئەوەی فێری سەرەش بوون، نەیاندەتوانی چاوەڕێی بکەن، هاواری دەکرد بەسەریاندا. ئیتر بلیتی پاسی نەدەفرۆشت، لەبەر ئەوەی هەموو جارێک کە پاسەکە لە سووچەکەوە دەر دەکەوت سێ-چوار کەس بە جۆشوخرۆشی سەربازە تالانکەرە مۆغولەکانەوە ڕایان دەکرد بۆ ناو دوکانەکە، بە وتنی، "دەی بلیت، بلیت، خێرا، بلیت." دوکانەکەیان تێک دەدا، دەوروبەریان دەدا بەسەریەکدا. ئەو ژن و مێردە چل ساڵانەی بینیبوو کاتێک یانسیبیان هەڵدەبژارد دەستیان دەکرد بە شەڕ لەگەڵ یەکتردا، ئەو ژنە بۆیاوییانەی بینیبوو، بۆ ئەوەی پاکەتێک سابوون بکڕن بۆنی سێ چەشنیان دەکرد، ئەو سەربازە پلەدارە خانەنشینانەی بینیبوو کە فوویان دەکرد بەناو یەک بە یەکی فیکەی ناو قوتووەکەدا بۆ ئەوەی یەک فیکە بکڕن، بەڵام ئیتر ڕاهاتبوو گوێی پێ نەدەدان. ئیتر گوێی نەدەدایە ئەو ژنی ماڵەی کە بۆڵەبۆڵی دەکرد لەبەر ئەوەی یەکێک لەو ژمارەی ڕۆمانە وێنەدارە کۆنانەی نییە کە کۆتاژمارەکەی یانزە ساڵ پێشتر دەر چووبوو، گوێی نەدەدایە ئەو ئەفەندییە قەڵەوەی پێش ئەوەی پوولی پۆستە بکڕێت، پشتی پوولەکەی دەلێسایەوە بۆ ئەوەی تامی لچکێنەرەکەی پشتی بکات. گوێی نەدەدایە ئەو ژنی قەسابەی کە ڕۆژی دواتر بەتووڕەییەوە گوڵەمێخەکەی دەگەڕاندەوە بۆ دوکانەکە بە هۆکاری ئەوەی بۆنی نایەت، لە کاتێکدا گوڵەکە بە کاغەزیش دروست کرابوو.

ئەم دوکانەی بە هەوڵ و تەقەللا و ئارەقەی ناوچاوانی دروست کردبوو. چەندەها ساڵ بە دەستی خۆی بەرگی

گرتبووە گۆڤارە کۆنەکانی *تەکساس* و *تۆمیکس*، بەیانییان کاتێک هەموو شار خەوتووە، دوکانەکەی کردووەتەوە، گسکی داوە، ڕۆژنامە و گۆڤارەکانی بە جلگرە هەڵواسیوە بە دەرگا و درەختی کەستانەکەی بەردەمی دوکانەکەیەوە، دوایین شمەکە نوێکانی جێگیر کردووە لە جامخانەکەیدا، چەندەها ساڵە بست بە بست، دوکان بە دوکان هەموو ئیستانبوڵ گەڕاوە، بۆ ئەوەی سەیرترین شمەک (پاریچەی سەماکارەکەی کە ئاوێنە موگناتیسییەکەی لێ نزیک دەکەیتەوە دەخولێتەوە، قەیتانە سێ ڕەنگییەکان، هەیکەلی بچووکی ئەتاتورکی لەبۆرەکدروستکراو کە چاوەکانی گڵۆپی شینی تێدا بوو دادەگیرسان، قەڵەمدادەر لە شێوەی ئاشەبای هۆڵەندیدا، تابلۆی نووسراوی خانوو بۆ کرێ و باسم للە الرحمن الرحیم، نوقڵی بۆن بنێشتی تاڵ کە لەناویدا وێنەی باڵندەی تێدا دەر دەچوو لە ژمارە یەکەوە تاکو ژمارە سەد، زاری پەمەیی تاوڵە کە بەتەنها لە بازاڕی داخراوی ئیستانبوڵدا دەست دەکەوت، وێنەی پشتلچکاوی تەڕەزان، باربارۆس، کڵاو لە ڕەنگی ئاڵای تیپە دووگۆڵییەکان - خۆیشی دە ساڵ کڵاوێکی ڕەنگ شینی لە سەر کردبوو، - ئامێرە ئاسنینەکانی کە سەرێکی پاژنەهەڵکێش بوو، سەرەکەی تری کلیلی ساردیهەڵپچڕین بوو) پێشکەشی مشتەرییەکانی بکات، لەبەر ئەوەی داوایان دەکرد، هەتا لەبەرامبەر داوا هەرە سەیروسەمەراکانیشدا (لەو مەرەکەبە شینەتان لا دەست دەکەوێت کە بۆنی ئاوی گوڵی لێ دێت؟ ئەو مستیلانەتان لا دەست دەکەوێت کە گۆرانی دەڵێت؟) نەیوتووە "نەخێر،" لەبەر ئەوەی بیری کردۆتەوە مادەم پرسیاری دەکەن نموونەیەکی هەیە، وتوویەتی، "بەیانی

دەیهێنم!" دواتر بە تێبینی لە دەفتەرەکەیدا نووسیویەتی، ڕۆژی دواتریش وەک گەڕۆکێک کە لەناو شاردا دەگەڕێت بۆ نهێنییەک، بۆ شمەکە داواکراوەکان گەڕاوە، پرسی لە دوکان بە دوکان کردووە و دۆزیویەتیەوە. سەردەمێکیش بووە کە بە شێوەیەکی باوەڕپێنەکراو، بێ هیلاکی، پارەی بە ڕۆمانە وێنەدارەکان یاخود چیرۆکە وێنەدارە عەسابەکان، یاخود وێنەی هونەرمەندە ناوخۆییە سیما بێهەستەکان پەیدا کردووە؛ سەردەمی ڕۆژانی وشک و ساردیشی بینیبوو، بە هۆی ئەوەی قاوە و جگەرە کەوتبوونە ناو بازاڕی ڕەشەوە، ڕیزێکی زۆر دەگیرا، نائاسوودەش ببوو. کاتێک لە دوکانەکەیەوە تەماشات دەکرد، هیچ تێنەدەگەیشتی کە ئەو لێشاوە مرۆڤەی کە دەڕژان"ئاوان، بەو شێوەیەن..." بەلام "یەک... یەک... - ئیتر نازانم -" مرۆڤێک بوون.

هەندێک جار کە تەماشات دەکرد، ئەو قەرەباڵغییەی هەریەکەیان بە هەوایەکی جیاواز دەبینرێن، هەموویان پێکەوە دەکەوتنە مەراقی قوتوویەکی جگەرەوە کە موزیکی لێدەدا، دواتر بەلێشاو یەکسەر دەستیان دەکرد بە کڕینی قەڵەمێکی مەرەکەب کە لە یابانەوە دەهات و هێندەی پەنجەتووتە گەورە بوو، مانگی دواتریش هەموویان بیر دەچووەوە، بە شێوەیەکی وەها دەستیان دەکرد بە کڕینی چەرخێک کە لە شێوەی دەمانچەدا بوو، عەلادین نەیدەتوانی فریایان بخات. دواتر، مۆدەی فلتەرێکی پلاستیک دەستی پێ دەکرد، هەموو میللەت بە شێوەی تێڕوانینی زانایەکی شێتەوە شەش مانگ فلتەرە پلاستیکەکەیان بەکار دەهێنا بۆ کێشانی ئەو قەتران و نیکۆتینە پیسەی جگەرەکە، دواتر وازیان لەوە دەهێنا، بە چەپەکان و ڕاستەکانەوە، ئیماندار و بێئیمان،

تەزبیحی ڕەنگاوڕەنگ و هەمەچەشنەی درێژیان دەکڕی، لە هەموو شوێنێکدا دەیانگرت بە دەستیانەوە، پێش ئەوەی ئەم لێشاوە هێور ببێتەوە و عەلادین ئەو تەزبیحانە بگەڕێنێتەوە کە لە دوکانەکەدا ماونەتەوە، مژدەی ڕوونکردنەوە و شیکردنەوەی خەو سەری هەڵدەدا، هەموو کەس ڕیزی دەگرت بۆ ئەوەی ئەو کتێبە بکڕێت کە خەوەکەی بۆ ڕوون دەکاتەوە. فیلمێکی ئەمەریکی دەهات، دواتر یەکسەر هەموو گەنجەکان چاویلکەی ڕەشیان دەکڕی، لە ڕۆژنامەیەکدا هەواڵێک دەر دەچوو، هەموو ژنەکان کرێمی لێویان داوا دەکرد، هەموو کوڕەکان داوای کڵاوی ئیمامییان دەکرد، بەڵام زۆربەی کات داواکارییەکان بە شێوەیەکی نەزانراو وەک تاعوونێک بڵاو دەبووەوە. بۆچی هەزارەها مرۆڤ لە یەک کاتدا دەستیان کردبوو بە دانانی ئەو بەلەمە چارۆکەدارە بچکۆلەیە، لەسەر ڕادیۆ، زەیتی، بەردەمی جامی دواوەی ئۆتومێلەکانیان، ژوورەکانیان، مێزی کارکردنیان، مێزی فرۆشیارییان؟ چۆن تێبگەیشتیتایە لەوەی کە دایک و منداڵ، ژن و پیاو، گەنج و پیر، هەموو کەس بە شێوەیەکی سەیر هەر هەمان وێنەی منداڵە سیمائەوروپاییە خەمبارەکەیان دەکڕی کە یەک تکە فرمێسکی گەورە بە چاویدا دێتە خوارێ، هەڵیان دەواسی بە دیوارەکانیانەوە و دەرگاکانیانەوە؟ ئەم میللەتە، ئەم مرۆڤانە یەک... یەک... ئەو وشەیەی کە عەلادین نەیدەتوانی بیدۆزێتەوە من فریایم خست، وتم، "سەیر،" وتم، "ناتوانیت تێیان بگەیت، هەتا ترسناکن،" چونکە دۆزینەوەی وشەکان کاری من بوو، نەک کاری عەلادین. بۆ ماوەیەک بێدەنگ بووین.

دواتر کاتێک باسی ئەو قازە بچووکانەی دەکرد کە لە ماددەیەکی پلاستیکی دروست کرابوون و سەریان

دەلەرییەوە، چەندەها ساڵ بوو دەیفرۆشت، باسی لەو چۆکۆلاتە و بەلالوکە کۆنانەی کە لە شێوەی شووشەدا بوون بەلالوکێکیشی تێدا بوو، یاخود باسی لەوە دەکرد پرسیاری لێ دەکەن کە قامیشی باش و هەرزان بۆ کۆلارە لەکوێی ئیستانبوڵدا دەست دەکەوێت، تێگەیشتم پەیوەندییەکی بەهێز هەیە لەنێوان عەلادین و مشتەرییەکانیدا کە خۆیشی ئەو وشانەی نەدەدۆزییەوە بۆ وەسفکردنی ئەم پەیوەندییە. هەموو مشتەرییەکانی خۆش دەویست، ئەو کچە بچووکەی خۆش دەویست کە لەگەڵ نەنکیدا (دایکی باوکی) دەهات بۆ دوکانەکە و لە بازنە زەنگوڵەدارەکانی دەکڕی، ئەو گەنجە خوێنگەرمە زیبکاوییەی خۆش دەویست کە گۆڤارە فەرەنسییەکەی هەڵدەگرت، دەچووە سووچێکی دوکانەکەوە و خەیاڵی خەوتنی لەگەڵ وێنەی ژنە ڕووتەکانی ناو پەڕەکانیدا دەکردەوە. ئەو ژنە چاویلکەلەچاوەشی خۆش دەویست کە کارمەند بوو لە بانک و ئەو ڕۆمانانەی دەکڕی کە ژیانی ئەستێرەکانی هۆلیوودی تێدا کرابوو بە چیرۆک و شەو لە ماڵەوە دەیخوێندەوە و بەیانیی ڕۆژی دواتر دەیگێڕایەوە، بۆ ئەوەی بیداتەوە بە عەلادین دەیوت، "من ئەم ڕۆمانەم هەیە!" ئەو پیرەشی خۆش دەویست کە بەپێداگرتنەوە دەیویست ڕۆژنامەیەکی بێوێنە بپێچێت لە وێنەی کچە قورئانخوێنەکەی. بەلام ئەم خۆشەویستییە خۆشەویستییەکی چاوەڕوانکراو بوو، بەڵکو کەمێک لەو دایک و کچە تێدەگەیشت کە قاڵبی جلوبەرگی ناو گۆڤاری مۆدەکەیان لە ناوەڕاستی دوکانەکەدا وەک نەخشەیەک دەکردەوە، دەستیان دەکرد بە بڕینی قوماش، یاخود کەمێک لەو منداڵانە تێدەگەیشت کە

پێش ئەوەی لە دوکانەکە بچنە دەرەوە دەبابە یاریچەکانیان دەدا بەیەکدا و دەستیان دەکرد بە جەنگ، بەڵام بەرامبەر ئەو مرۆڤانەی کە پرسیاری ئەو لایتانەیان دەکرد کە لە شێوەی قەڵەمدان، یاخود پرسیاری مەدالیای شێوەی کاسەی سەریان دەکرد بۆ کلیل، دەکەوتە ناو هەستێکەوە وەک بڵێی ئیشارەتی لە دنیایەکەوە بۆ دەنێرن کە هیچ نایزانێت، هیچ ناتوانێت تێی بگات. ئەو پیاوە نهێنیدارەی کە لە ڕۆژێکی بەفراویی زستاندا دەهات لەجیاتیی داوای دیمەنی زستان بکات، بەپێداگرییەوە داوای دیمەنی هاوینی دەکرد، بۆ ئەرکی قوتابی لە قوتابخانە، نیشانەی چ نهێنییەکی هەڵگرتبوو؟ شەوێکیان کاتێک لەوەدا بووە کە دوکانەکەی دابخات، دوو کەسی تارماییئاسا هاتوونەتە دوکانەکەوە، وەک دکتۆرێک کە کۆرپەیەک بەئاگا و بەخۆشەویستییەوە دەگرێتە دەست، ئەو کۆرپە بووکەشووشانەیان گرتۆتە دەست کە دەست و قۆڵیان بۆ خوارەوە و بۆ سەرەوە جووڵە دەکات و جلوبەرگی ئامادەکراویان لەبەردایە، بە شێوەیەک سەیری چاونوقاندن و چاوکردنەوەی بووکە پەمەییەکەیان کردووە، وەک بڵێی جادوویان لێ کرابێت، شووشەیەک عارەق و بووکێکیان بە عەلادین کردۆتە ناو پاکەتێکەوە، لەناو ئەو تاریکاییەدا ون بوون کە مووەکانی عەلادینی ڕاچڵەکاندووە. عەلادین دوای چەندەها ڕووداوی لەم شێوەیە کە بەسەریدا هاتووە، ئێستا لە خەویدا ئەو بووکانە دەبینێت کە لە دوکانەکەیدا لەناو قوتوو و عەلاگەدا دەیانفرۆشێت، بیری دەکردەوە کە شەوانە دوای ئەوەی دوکانەکەی دادەخات، بووکەکان بەهێواشی چاوەکانیان دەکەنەوە و دای دەخەنەوە، قژیان درێژ دەبێت.

بەڵکو پرسیاری لێ دەکردم ئایا ئەمە ئیشارەتی چییە، بەڵام کەوتبووە ناو ئەو بێدەنگییە بێچارەیی و خەمبارییەی کە هاونیشتیمانییەکانمان هەستی پێ دەکەن دوای ئەوەی بە دەردەکانی خۆیان دنیا زۆر سەرقاڵ دەکەن. ئەم جارەیان بە زانینی ئەوەی کە بێدەنگییەکەمان درێژخایەن دەبێت، هەردووکمان پێکەوە بێدەنگ بووین.

زۆر دواتر کاتێک عەلادین بە هەوایەکی وەک بڵێی داوای لێبوردن بکات لە ماڵەوە چووە دەرەوە، پێی وتم کە ئیتر تۆ باشتر دەزانیت، ئیتر تۆ چۆنت دەوێت وەها بینووسە: خوێنەرە خۆشەویستەکانم، بەڵکو ڕۆژێک نووسینێکی باش دەنووسم لەبارەی ئەو بووکەڵانە و خەوەکانمانەوە.

# ئەو دەمەی ئاوی گەروو لە کەمبوونەوەدایە

**[لەکتێبی *ڕەشــەوە*. خەیاڵەکانی جەلال سالیکی گۆشەنووس.]**

درکتان کردووە کە ئاوی گەروو لە کەمبوونەوەدایە؟ باوەڕ ناکەم. لەم ڕۆژانەدا کە یەکتری دەکوژین، بە جۆشوخرۆش و کەیفی ئەو منداڵانەی دەچن بۆ ئاهەنگی جەژن، چ یەکێک لە ئێمە شتێک دەخوێنێتەوە و ئاگاداری دنیایە؟ هەموومان، هەتا گۆشەنووسەکانیشمان بەنیوەناچڵ دەخوێنینەوە لە بەندەری پاپۆڕەکاندا کە بە ئانیشک پاڵ بە یەکترییەوە دەنێین، لە بۆشایی ناو پاسەکاندا کە لە باوەشی یەکتردا دەتلێینەوە، لەسەر کورسیی مینیبوسەکان کە وشەکان لە بەرچاوماندا دەلەرنەوە. من هەواڵەکەم لە گۆڤارێکی جیۆلۆجی فەرەنسیدا خوێندەوە.

دەریای ڕەش گەرم دەبێت، دەریای سپی سارد دەبێتەوە. لەبەر ئەوەی ئاوی دەریا ڕژاوەتە ناو ئەو ئەشکەوتە

گەورانەی لە بنی دەریادان، لە ئەنجامی هەمان جوولەش بنی گەرووی جەبەلی تاریق و چەناککەلە[1] و گەرووی ئیستانبوڵ دەر کەوتووە. یەکێک لەو دوایین ماسیگرانەی کە لە کەناری گەروودا گفتوگۆمان لەگەڵدا کرد، بە وتنی ئەوەی لەو ئاوەدا کە لە کۆندا هێندەی درێژیی منارەیەک زنجیرمان بەکار دەهێنا بۆ ئەوەی پاپۆڕەکەمان جێگیر بکەین، ئێستا لە هەمان ئاودا پاپۆڕەکەی لەسەر وشکایی لەنگەری گرتووە،

پرسیی: سەرۆکوەزیرانمان گرنگی بەم بابەتە نادات؟

نازانم. ئەوەی دەیزانم ڕوونکردنەوە و گفتوگۆکردنە لەسەر ئەو ئەنجامە نزیکانەی کە بە هۆی ئەم ڕووداوەوە دێتە مەیدانەوە کە بەخێرایی لە گەشەسەندندایە. بەئاشکرا دیارە دوای ماوەیەکی کەم، ئەو شوێنە بەهەشتییەی کە زەمانێک بوو پێمان دەوت 'گەروو' دەبێت بە زۆنگاوێکی ئەنگوستەچاو، کە لاشەی کەشتییە چارۆکەدارەکان تێیدا بە قوڕێکی ڕەش سواغ دراوە، وەک تارماییەکان ددانە شەوقدارەکانیان پیشان دەدەن. لە کۆتایی هاوینێکی گەرمیشدا ئەم زۆنگاوە وەک بنی ڕووبارێک کە ئاو دەدات بە شارۆچکەیەک وشک دەبێتەوە و دەبێت بە قوڕ، هەتا پێشبینیی ئەوەش ئەستەم نییە بەو ئاوی زێرابانەی وەک شەلالە لە دەمی هەزارەها بۆریی گەورەوە دەڕژێنە ناوی، گژوگیا و گوڵەبەیبوون سەوز ببێت لە قەدپاڵەکانیدا. لەم دۆڵە قووڵ و ترسناکەی کە قەڵای کچ[2] لەسەر گردێک وەک

١ چەناککەلە: شارێکە لە ڕۆژئاوای تورکیا.

٢ قەڵای کچ: لە سەدەی پێنجی پێش زاییندا لەلایەن یۆنانییەکانەوە دروست کراوە، لەناو ئاوی گەروودایە و لەنزیک گەرەکی ئوسکودارەوەیە کە نزیکە لە بەری ئاسیای ئیستانبوڵ.

قەڵایەکی ڕاستەقینەی ترسناک بەرز دەبێتەوە، ژیانێکی نوێ دەست پێ دەکات.

باس لەو گەڕەکە نوێیانە دەکەم کە لەناو قوڕی ئەو بۆشاییەدا دروست دەکرێن کە لە کۆندا پێیان دەوت 'گەروو،' کارمەندەکانی شارەوانی بە پسووڵەی سزادانەوە دەگەڕێن لێرە و لەوێیدا: باس لە خانووە بێتاپۆکان و بارە سادەکان و پاڤییۆن و شوێنی ڕابواردنەکان و شاری یارییەکان و قومارخانەکان و مزگەوتەکان و تەکیەی دەروێشەکان و شوێنی ڕێکخراوی مارکسیستەکان و کارگەکانی دروستکردنی گۆرەویی نایلۆن و شوێنی پلاستیکفرۆش و کەبابخانەکانی... لەناو ئەم پشێوییە قیامەتییەدا پاپۆڕە نوقمبووەکانی کۆمپانیای خایری کە لەسەر لا نیشتوون، سەرە شووشەی گەزۆز، دەنیز ئاننەسی[1] دەبینرێت. لە دوایین ڕۆژدا کاتێک ئاوەکە کەم دەبێتەوە، لەنێوان کەشتییە ئەمەریکییە گەورە گەشتیارییە نوقمبووەکان، پایە ئیۆنییە[2] قەوزاوییەکاندا ئێسکەپەیکەر دەمکراوەکانی کەلتی و لیکیالی دەبینرێت کە دەپارێنەوە لە خوا نەزانراوەکانی سەردەمی پێش زایین. دەتوانم بیر لەوەش بکەمەوە، لەو شارستانییەتەدا کە بەرز دەبێتەوە لەنێوان خەزێنە بیزەنتییەکان کە بە گوێچکەماسی داپۆشراون، چەقۆ و چەتاڵی زیو و تەنەکە، بەرمیلەشەرابی هەزار ساڵە، شووشەی گەزۆز، لاشە لووت تیژەکانی کەشتییە چارۆکەدارەکاندا، وزەی خستنەکاری

---

١ دەنیزئاننەسی: ماسی لچقاو.

٢ پایەی ئیۆنی: پایەیەکە کە سەرەوە و خوارەوە لە شێوەی کاغەزێکی لوولدا دروست دەکرێت، شێوازێکی کۆنە.

ئاگـردان و گلۆپـەکان لـە یەکێـک لـە کەشـتییە کۆنـە ڕۆمانییـە نەوتهەڵگرەکانـەوە وەر دەگـرن کـە پەروانەکـەی چەقیوەتـە لیتـەی زۆنگاوەکـە. بـەڵام ئـەو شـتەی کـە دەبێـت خۆمـان بـۆ ئامـادە کردبێـت لـەم چاڵـە لەعنەتییـەدا کـە بـە شـەلالەی ئـاوی پیسـی سـەوزی تۆخـی زێرابـی هەمـوو ئیسـتانبوڵ ئـاو دەدرێت، لەنـاو ئـەو غـازە ژەهراوییانـەی کە لەژێـر زەوییـەوە دێتـە دەر، نـاو زۆنـگاوە وشـکبووەکان، نـاو لاشـەی ماسـیی دۆلفیـن، ماسـیی قەڵغـان، ماسـیی مشـارییەکانی پێش زاییندا، ئەو نەخۆشـییە سـارییە نوێیەیـە کە دێتە مەیدانـەوە لەنـاو ئـەو سوپا مشـکانەی کە بەهەشـتە نوێیەکەیـان دۆزیوەتـەوە. دەزانـم وە ئاگادارتـان دەکەمـەوە: ئـەو ڕۆژە، ئـەو نەهامەتییـەی لـەم ناوچـە نەخۆشـیاوییەدا ڕوو دەدات، کـە چواردەوری بـە تەلـی درکاوی دەگیرێـت، کار لـە ناخـی هەموومـان دەکات.

لـەو باڵەکۆنانـەی کـە سـەردەمێک بـوو سـەیری تریفـەی مانگمـان لێوە دەکرد، کە ئاوە ئاوریشـمییەکەی گەرووی وەک زیـو دەدرەوشـاندەوە، ئیتـر سـەیری ڕووناکیـی دووکەڵێکـی شـینباو دەکەیـن کـە لـەو مردووانـەوە بـەرز دەبێتـەوە کـە نەیانتوانیـوە بیاننێژن و بەخێرایـی سـووتاندویانن. لەسـەر ئـەو مێزانـەی کەنـار دەریـادا کـە بـە بۆنکردنـی فێنکییـە دڵفڕێنەکـەی پەنجەخانم و درەختی ئەرخەوانەوە عارەقمان دەخواردەوە، تام و بۆنـی ئـەو تـرش و تفتییـە کەڕوواوییـەی مـردووە ڕزیـوەکان دەکەیـن کـە گەروومـان دەسـووتێنێتەوە. ماسـیگرەکان لەسـەر سـەکۆی بەندەرەکانـەوە کـە هەمـوو کات بەڕیـز دەوەسـتان بـۆ ماسـیگرتن، ئیتـر گوێبیسـتی خوڕەی ئـاوی گـەروو و گۆرانییـە ئاسـوودەکەرەکانی باڵندەکانـی بەهـار نابـن، هاوارهـاواری ئـەو

کەسانە دەبیستریت کە لە ترسی مردن دەکەونە گیانی یەکتر بە هەڵگرتنی ئەو تفەنگ و دەمانچە و تەورە ژەنگاوی و خەنجەر و شمشێرە هەمەچەشنانەی کە لە ترسی ئەو پشکنینانەی هەزار ساڵ درێژەی کێشاوە فڕێ دراونەتە ناو دەریاوە. ئەو ئیستانبوڵییانەی سەردەمێک بوو لە لادێکانی کەنار دەریادا دەژیان، کاتێک شەو بەهیلاکی دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان، ئیتر پەنجەرەی پاسەکانی شارەوانی ناکەنەوە بۆ ئەوەی بۆنی قەوزەی دەریا بکەن؛ ڕێک بە پێچەوانەوە، بۆ ئەوەی بۆنی قوڕ و جەستەی ڕزیوی مردوو نەیەتە ناو پاسەکەوە، قوماش و ڕۆژنامە دەئاخننە کەنار ئەو پەنجەرانەی کە لێوەی سەیری تاریکاییە ترسناکەکەی خوارەوە دەکەن کە بە کڵپەی ئاگر ڕووناک دەبێتەوە. ئیتر لەو قاوەخانانەی کەنار دەریاوە کە لەگەڵ میزەلانفرۆش و فرۆشیاری پسکیتی بە حەڵوادا تێیدا کۆ دەبووینەوە، سەیری ڕازاندنەوەی ئاهەنگەکان ناکەین، لەمەودوا سەیری ڕووناکیی سووری خوێنڕەنگی تەقینەوەی ئەو ئەڵغامانە دەکەین کە منداڵە فزوولەکان دەستکارییان کردووە و بە خۆشیاندا تەقیونەتەوە. ئەو مرۆڤانەی لە کاتی بای باشووردا پارەی نانیان پەیدا دەکرد بە کۆکردنەوەی ئەو پارەی بیزەنتی و قوتووی بەتاڵی خواردنانە کە دەریا گەردەلوولییەکە کۆی دەکردنەوە لە لمی کەناردا، ئیتر پارەی نانیان لەو دەستاڕی قاوە، لەو کاتژمێری جریوە بولبولانەی کە قەوزە گرتوونی، لەو پیانۆ ڕەشە داپۆشراو بە توێکڵی گوێچکەماسییانە دەست دەکەوێت کە سەردەمێک لافاوی ئاو لە خانووە تەختەکانی لادێکانی کەنار دەریادا پچڕاندوونی و کۆی کردوونەتەوە لە

قووڵاییەکانی گەرووداا. ئیتر من لە یەکێک لەو ڕۆژانەدا، لە نیوەشەوێکدا لەناو تەلە دڕکاوییەکانەوە خۆم دەدزمەوە بۆ ناو ئەم جەهەننەمە نوێیە، بۆ ئەوەی کادیلاکە ڕەشەکە بدۆزمەوە.

خاوەنی کادیلاکە ڕەشەکە چەتەیەکی بەیئۆغلۆ بوو (نامەوێت پێی بڵێم خوێڕی) پاترۆنی شوێنێکی هەڵخەڵەتێنەر و قۆڵبڕ بوو کە سی ساڵ لەمەوبەر کاتێک من هەواڵنێرێکی نەشارەزا بووم شوێن ڕووداو و ئەزموونەکانی دەکەوتم، شەیدای ئەو دوو وێنەیەی ئیستانبوڵ بووم کە لە دەروازەی شوێنەکەیدا هەڵواسرابوو. لە ئیستانبوڵدا دوو هاوشێوەی ئۆتومبێلەکەی هەبوون، خاوەنی یەکێکیان داغدەلەن بوو کە دەوڵەمەندی ڕێگەی ئاسنینی ئەو سەردەمە بوو، یەکێکیشیان لای مەعروفی پاشای تووتن بوو. چەتەکەمان کە ئێمەی ڕۆژنامەنووسان ئەفسانەییمان کردووە، لە نیوەشەوێکدا کاتێک لەلایەن پۆلیسەوە فشاری دەخرێتە سەر، بە کادیلاکەکەیەوە، لەگەڵ خۆشەویستەکەیدا لە لووتی خوڕەوە[1] فڕیوەتە ناو ئاوی تاریکی گەرووەوە، هەر وەک چەتەیەک کە ئەسپەکەی تاو دەدات ڕووەو لێژاییەکی سەخت، بەگوێرەی بانگەشەیەک بە هۆی سەرخۆشبوونی بە ماددەی ئەسرارەوە، بەگوێرەی بانگەشەیەکی تر بەئەنقەست ئەم ڕووداوەی دروست کردووە. من لە ئێستاوە پێشبینی دەکەم ئەو کادیلاکە لەکوێدایە کە چەندەها ڕۆژ پیاوانی بن دەریا لە ئاوە خوڕەکەی ژێر دەریادا بۆی گەڕاون و نەیاندۆزیوەتەوە، هەروەها ڕۆژنامەنووسەکان و خوێنەرەکانیش بیریان چۆتەوە.

---

١ لووتی خوڕ: سووچێکی تیژە لە گەروودا، کە لەو خاڵەدا ئاوی گەروو زۆر بەخوڕی ڕێ دەکات، ئەم خاڵە نزیکە لە بەری ئەوروپای ئیستانبوڵ، کە نزیکی گەڕەکی ئەرنەووت کوێیە.

لەوێدا، لە قوولاییی ئەو دۆڵە نوێیەدا کە لە کۆندا پێی دەوترا 'گەروو' لە دامێنی لێژاییيەکی قوڕاویدا کە تاکە جزمەکان، پێڵاوی حەوت سەد ساڵە کە قرژاڵەکان لانەیان تێدا دروست کردووە، ئێسقانی حوشتر، ئەو شووشانەی پڕە لە نامەی عەشق و نازانرێت بۆ چ خۆشەویستێک نووسراوە، ئیشارەتی پێ دەدەن لە شوێنێکدایە لەپشتەوەی ئەو هەورازانەی کە داپۆشراون بە ئەڵماس و گوارە و سەری شووشەی گەزۆز و بازنە ئاڵتوونییە درەوشاوەکان و دارستانی گوێچکەماسی و ئسفینج، کەمێک لەولا قومە زەرووە توێکڵدارە منارەییەکانەوە، تاقیگە هیرۆینییەکەی کە لەناو بەلەمێکی ڕزیودا بەخێرایی دروست کراوە، گوێچکەماسییەکانی کە بە خوێنی ئەو بارگیر و کەرانە ئاو دراون کە سجووقدروستکەرە قاچاخەکان سەریان بڕیون.

بە گوێگرتن لە هۆڕنی ئەو ئۆتومبێلانەی کە بەسەر ئەو جادە قیرەدا ڕێ دەکەن کە لە کۆندا پێیان دەوت، "ڕێگەی کەنار دەریا،" بەڵام ئێستا زیاتر لە ڕێگەی سەر شاخ دەچێت، کاتێک دادەبەزمە ناو ئەو تاریکاییيە بێدەنگە بۆگەنەوە، دەگەڕێم بۆ ئۆتومبێلەکە، ڕێکەوتی فیلبازەکانی دژ بە سەرا دەکەم، کە هێشتا باری دوقەدبوونیان پاراستووە لەناو ئەو گوێنییەی تێیدا خنکاون، ڕێکەوتی پەیکەری ئێسقانی قەشەکانی ئۆرتەدۆکس دەکەم کە باوەشیان کردووە بە خاچ و گۆچانەکانیاندا و مەچەکیان سقلی ئاسنینی پێوە بەستراوەتەوە. کاتێک ئەو دووکەڵە شینباوە دەبینم کە لە دووربینی شێوەبۆریی زۆپای ئەو کەشتییە ژێردەریاییيە ئینگلیزییەوە دەر دەچێت، کاتێکدا ویستوویەتی مووشەکی

دەریایی بنێت بە کەشتییەکەی گوڵجەماڵەوە، کە لە بەندەری تۆپخانەوە[1] سەربازی گوێزاوەتەوە بۆ چەناککەلە، تۆڕی ماسیی ڕاوچییەکان ئالاوە لە پەروانەکەی و لووتیشی داویەتی بە تاوێرە قەوزاوییەکاندا و دواتر نیشتۆتە بنی دەریا، تێدەگەم کە هاونیشتمانییەکانمان لەو شوێنەدا کە پەیکەری ئێسقانی ئەو ئینگلیزانەیان تێدا پاک کردۆتەوە کە لە بێئۆکسجینیدا خنکاون و دەمیان کراوەتەوە، لەسەر ئەو قەنەفەیەی فەرماندە کە قوماشی قەدیفەی تێ گیراوە، لە لانە نوێکەیاندا کە بەئاسوودەییەوە ڕاهاتوون تێیدا، لەناو ئەو پۆرسەلانە چینییانەی کە لە کارگەکانی لیڤەرپوڵ دروست کراون، چای ئێوارە دەخۆنەوە. لەولاترەوە لە تاریکاییەکەدا، لەنگەرێکی ژەنگاویی کەشتییەکی زرێپۆشی جەنگیی سەر بە کایزەر ویلهام دەبینرێت؛ شاشەی تەلەڤزیۆنێک کە سەدەفاوی بووە، چاوم لێ دەترووکێنێت. پاشماوەی خەزێنەیەکی جەنەڤیزی، کە تالان کراوە، تۆپێکی جەنگیی لوولەکورت کە ناوەکەی بە قوڕ گیراوە، وێنە و بتی بە گوێچکەماسی داپۆشراوی هەندێک قەوم و دەوڵەت کە ڕووخاون و نەماون، گڵۆپی تەقیوی سوورەبیایەکی ماددەزەرد دەبینم کە لەسەر نووکەکەی وەستاوە. کاتێک ڕێ دەکەم بۆ خوارەوە بۆ ناو قوڕ و تاوێرەکان، سەیری پەیکەری ئێسقانی ئەو کۆیلانە دەکەم کە بەسەبرەوە بەدیار سەوڵە زینجیرییەکانیانەوە دانیشتوون و سەیری ئەستێرەکان دەکەن. لەوانەیە سەرنجی ملوانکە و چاویلکە و چەترەکان نەدەم کە بە قەوزە درەختئاساکەوە شۆڕ بوونەتەوە، بەڵام بۆ ساتێک بەوریایی و ترسەوە

---

١ تۆپخانە: گەڕەکێکە لە کەنار دەریا لە ئیستانبوڵ، لە بەری ئەورووپا.

سه‌یری سوارچاکه خاچییه‌کان ده‌که‌م که به هه‌موو چه‌ک و گولله‌به‌ند و تاقمی پێداویستییه‌کانیانه‌وه سواری په‌یکه‌ری ئێسقانی ئه‌سپه نایابه‌کانیان بوون، که تاکو ئێستاش به‌عینادی به پێوه وه‌ستاون. ئه‌و کاته به‌ترسه‌وه تێده‌گه‌م که په‌یکه‌ری ئێسقانی خاچییه‌کان به نیشانه و چه‌که‌کانیانه‌وه که به گوێچکه‌ماسی داپۆشراون چاوه‌ڕێی کادیلاکه ڕه‌شه‌که ده‌که‌ن، که یه‌کسه‌ر له‌ولایانه‌وه وه‌ستاوه.

به‌هێواشی و به‌ترسه‌وه وه‌ک بڵێی مۆڵه‌ت له پاسه‌وانه خاچییه‌کان وه‌ر بگرم، نزیک ده‌بمه‌وه له کادیلاکه ڕه‌شه‌که‌ی ته‌نیشتیان، که جارجارێک تیشکێکی فسفۆڕ ڕووناکی ده‌کاته‌وه و نازانرێت له‌کوێوه دێت. زۆر له ده‌سکی ده‌رگاکانی کادیلاکه‌که ده‌که‌م، به‌ڵام ناتوانم بیکه‌مه‌وه، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی سه‌راپا داپۆشراوه به گوێچکه‌ماسی و که‌ستانه‌ی ده‌ریایی، په‌نجه‌ره سه‌وزباوه‌کانی به هیچ شێوه‌یه‌ک له شوێنی خۆیان ناجووڵێن و ناکرێنه‌وه. ئه‌وکات قه‌ڵه‌مجافه‌که له گیرفانمدا ده‌ر ده‌هێنم، به کلکی قه‌ڵه‌مه‌که به‌هێواشی چینه قه‌وزه ڕه‌نگ سه‌وزه فستقییه‌که ده‌کرێنم که یه‌کێک له جامه‌کانی داپۆشیوه.

له نیوه‌ی شه‌ودا، له‌م تاریکاییه ترسناک و جادووییه‌دا کاتێک شقارته‌که‌م داده‌گیرسێنم په‌یکه‌ری ئێسقانی چه‌ته‌که و خۆشه‌ویسته‌که‌ی ده‌بینم، که به قۆڵه باریکه بازناوییه‌کانیه‌وه، به په‌نجه مستیله‌داره‌کانیه‌وه له کورسییه‌که‌ی پێشه‌وه‌دا پێکه‌وه باوه‌شیان کردووه به یه‌کتردا، ماچی یه‌ک ده‌که‌ن له‌به‌ر ڕووناکییه مه‌عده‌نییه‌که‌ی سوکان و پێوه‌ره ستیله‌کان و سه‌عات و گێچی ئوتومبێله‌که‌دا، که تا ئێستاش وه‌ک گولله‌به‌ندی خاچییه‌کان ده‌دره‌وشێته‌وه. ماچێکی نه‌مر

کاسەی سەریان پێکەوە نوساوە، بەتەنها ئێسقانی چەناگەیان نەچووەتە ناو یەک.

ئەوکات بێ ئەوەی جارێکی تر شقارتەکەم دابگیرسێنم، کاتێک دەگەڕێمەوە بۆ دواوە بەرەو گڵۆپەکانی شار، بە بیرکردنەوە لەوەی دڵخۆشترین ڕێگە بۆ پێشوازیکردنی مانونەمان لە ساتی بەڵادا، بەئازارەوە بانگی خۆشەویستێکی دوور دەکەم: "گیانەکەم، جوانەکەم، بەدبەختەکەم، دەمی بەڵا هات، وەرە بۆ لای من، لە هەرکوێیەکی وەرە، حەز دەکەیت لە ئۆفیسێکدا کە پڕە لە دووکەڵی جگەرە، حەز دەکەیت لە موبەقێکی پیازاوی ماڵێکدا کە بۆنی جلوبەرگی لێ دێت، حەز دەکەیت لە ژوورێکی نووستنی شینی شێواودا، لە هەرکوێیەکی وەرە، کات تەواوە، وەرە بۆ لام؛ ئیتر کاتی ئەوە هاتووە بە هەموو هێزمان باوەش بکەین بە یەکتریدا، چاوەڕوانی مردن بکەین لەناو بێدەنگیی ژوورێکی کەمڕووناکدا کە پەردەکانی دادراونەتەوە، بۆ ئەوەی ئەو بەڵا ترسناکەمان بیر بچێتەوە."

# ئۆرهان پاموك

ساڵی١٩٥٢ لە ئیستانبوڵ لەدایک بووە و لە ماڵباتێکی هاوشێوەی ماڵباتەکانی ناو ڕۆمانەکانی *جەودەت بەگ و کوڕەکانی* و *کتێبی ڕەش*، لە نیشانتاشی، بەشەشاری دەوڵەمەندنشین و بەڕۆژئاواییبووی ئیستانبوڵ پێگەیشتووە. وەک خۆیشی لە کتێبی *ئۆتۆبیۆگرافی ئیستانبوڵ*دا باسی کردووە، لە منداڵییەوە تا تەمەنی بیستودوو ساڵی، خووی داوەتە نیگارکێشان و پێی وا بووە لە داهاتوودا دەبێت بە شێوەکار. قۆناغی ئامادەییی لە قوتابخانەی کۆلێژی ڕۆبێرتی ئەمەریکایی، لە ئیستانبوڵ خوێندووە. دوای سێ ساڵ خوێندنی شێوەکاری و بیناسازی لە زانکۆی تەکنەلۆژیی ئیستانبوڵ، تێدەگات نابێت بە بیناساز و شێوەکار، بۆیە دەست لە خوێندن هەڵدەگرێت. لە زانکۆی ئیستانبوڵ دەست بە خوێندنی ڕۆژنامەگەری دەکات. پاموک لە تەمەنی بیست و سێ ساڵییەوە بڕیار دەدات ببێت بە ڕۆماننووس، دەست لە هەموو شتێکی تر هەڵدەگرێت، خۆی دەخزێنێتە سووچی ماڵەوە و دەست دەداتە نووسین.

ڕۆمانی یەکەمی، *جەودەت بەگ و کوڕەکانی*، ساڵی ١٩٨٢ بڵاو کرایەوە. ئەم ڕۆمانە خەڵاتی ئۆرهان کەمال و خەڵاتی ڕۆمانی ڕۆژنامەی *میللیەتی* وەر گرت. ساڵی دواتر، پاموک ڕۆمانی *ماڵی بێدەنگی* خستە بازارەوە. ئەم ڕۆمانە، پاش وەرگێڕانی بۆ زمانی فەرەنسی، ساڵی ١٩٩١ خەڵاتی Prix de la Découverte Européeneی پێ درا. ڕۆمانی *قەڵای سپی*، چیرۆکی ناکۆکی و دۆستایەتیی نێوان کۆیلەیەکی ڤینیسیایی و زانایەکی عوسمانی دەگێڕێتەوە و نووسەر لە ساڵی١٩٨٥دا، بەچاپی گەیاندووە. پاش ئەوەی ساڵی ١٩٩٠، بۆ زمانی ئینگلیزی و چەند زمانێکی تری ڕۆژئاوایی وەر گێڕدرا، یەکەم ڕۆمان بوو ناوبانگی پاموکی گەیاندە ئاستی نێودەوڵەتی. ساڵی ١٩٨٥، خۆی و هاوسەری چوونە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و ماوەی سێ ساڵ لە زانکۆی کۆڵۆمبیا، لە نیو یۆرک وەک «زانای میوان» کاری کرد. لەوێ، بەشێکی زۆری ڕۆمانی *کتێبی ڕەش*ی نووسی. نووسەر لەو ڕۆمانەدا، لە میانەی پارێزەرێکەوە کە بەدوای هاوسەری ونبووی خۆیدا دەگەڕێت، باسی کۆڵان و شەقامەکانی ئیستانبوڵ، ڕابردووی شار، پێکهاتە و ڕایەڵەکانیمان بۆ دەگێڕێتەوە. ڕۆمانی *کتێبی ڕەش*، ساڵی ١٩٩٠ لە تورکیا بڵاو کرایەوە و دوای وەرگێڕانی بۆ زمانی فەرەنسی، خەڵاتی Prix France Cultureی وەر گرت. *کتێبی ڕەش*، ئەزموونێکە باسوخواسی زۆری هەڵگرتووە و ناوبانگی پاموکی زیاتر بە تورکیا و جیهاندا بڵاو کردەوە.

*ژیانی نوێ*، ڕۆمانێکی تری پاموکە و بەسەرهاتی فێرخوازێکی زانکۆ دەگێڕێتەوە، کە دەکەوێتە ژێر کاریگەریی

کتێبێکی جادووییەوە. ئەم ڕۆمانە ساڵی ١٩٩٤ بڵاو کراوەیەوە و ژمارەیەکی پێوانەیی لە فرۆشتندا تۆمار کرد. نووسەر، ساڵی ١٩٩٨ ڕۆمانی *من ناوم سوورەی* بڵاو کردەوە. ئەم ڕۆمانە کە چیرۆکی وەستایانی نیگارکێشی عوسمانی و ئێرانی و جیهانی ڕۆژئاوامان بۆ دەگێڕێتەوە، ساڵی ٢٠٠٢ لە فەرەنسا خەلاتی Prix du Meilleur Livre étranger، لە ئیتاڵیا خەلاتی Grinzane Cavour و ساڵی ٢٠٠٣، لە ئیرلەندا خەلاتی International Impac-Dubliی وەر گرت.

پاموک لە ناوەڕاستی ساڵانی نەوەدی سەدەی ڕابردوو، دەستی دایە وتارنووسین لە بوارەکانی مافی مرۆڤ و ئازادیی بیروڕادەربڕیندا و کەوتە ڕەخنەگرتن لە دەوڵەتی تورکیا، بەڵام خۆی زۆر بە سیاسەتەوە سەرقاڵ نەکرد. کۆلبژێرێکی لە وتارە ئەدەبی و کولتوورییەکانی بۆ ڕۆژنامە و گۆڤارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان کۆ کردەوە و ساڵی ١٩٩٩، لە دووتوێی کتێبێکدا بە ناوی *ڕەنگەکانی تر* بە چاپی گەیاند. ساڵی ١٩٩٢ چەندین جار لە ئیستانبوڵ هێرش کرایە سەر بارەگای ڕۆژنامەی *ئوێزگوێر گوێندەم*ی زمانحاڵی کوردانی باکوور و ژمارەیەک ڕۆژنامەنووسی کورد ڕفێندران و تیرۆر کران. ئەو کاتە پاموک یەکێک بوو لەو ڕۆشنبیرە تورکانەی کە وەک پشتیوانیی بۆ ئازادیی ڕادەربڕین و ڕۆژنامەگەری ڕۆژێک تا ئێوارە لە شەقامی ئیستیقلال، چاپی ئەو ڕۆژەی ڕۆژنامەی باسکراوی فرۆشت. نووسەر ڕۆژی ٧ی شوباتی ٢٠٠٥، لە لێدوانێکدا بۆ گۆڤاری *ماگەتیسینی* سویسرایی گوتی، «لەم سەرزەمینە ملیۆنێک ئەرمەنی و سی هەزار کورد کوژران و من یەکەم تورکم کە دان بەم ڕاستییەدا

دەنێم.» پامـوک دوای ئـەو لێدوانـە ڕووبـەڕووی هێرشـی توندی ناوەندە ڕەگەزپەرستەکان و میدیاکانی تورک بووەوە و داواکاری گشتی بە تۆمەتی سووکایەتیکردن بە تورکایەتی و بـە پشتبەسـتن بـە مـادەی ٣٠١ی بەدنـاوی یاسـای سـزای تورک، دوای حەوت مانگ تا سێ ساڵ زیندانیکردنی بۆ کرد. بەڵام لەپاش زیادبوونی گوشارە ناوخۆیی و دەرەکییەکان بۆ سەر دەوڵەتی تورک، دادگا لە ٢٣ی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٧، دۆسیەی پاموکی داخست و کۆتایی بەو دۆزە هێنا.

پاموک ساڵی ٢٠٠٢، ڕۆمانی *بەفری* بڵاو کردەوە و نووسەر خۆی، بە یەکەمین و دوایین ڕۆمانی سیاسیی دادەنێت. ڕووداوەکانی *بەفر*، لە شاری قارس دەقەومێن و ئیسلامی سیاسی، سوپا، لایست و توندوتیژی و ناکۆکییەکانی نێوان نەتەوەپەرستانی کورد و تورک دەخاتە بەرچاوان. نووسەر بەم ڕۆمانە شێوازێکی نوێی نووسینی ڕۆمانی سیاسیی تاقی کردەوە. ڕۆژنامەی *نیو یۆرک تایمز* لە ساڵی ٢٠٠٤دا، ڕۆمانی *بەفری* خستە ڕیزی باشترین ١٠ کتێبی ساڵەوە لەسەر ئاستی جیهان. ئیستانبوڵ کتێبێکی تری پاموکە، لە ساڵی ٢٠٠٣دا چاپ کراوە. نووسەر لەو کتێبەدا، بیرەوەرییەکانی خۆی تا تەمەنی بیستودوو ساڵی دەگێڕێتەوە. ئەو کتێبە شیعرئامێزەی پاموک، کە بە وێنەی ئەلبومی تایبەتیی نووسەر خۆی، وێنەی هونەرمەندانی شێوەکاری بیانی و ناوخۆیی ڕازێندراوەتەوە، پۆلێنکردنی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە کارێکی دژوارە.

*مۆزەخانەی پاکیزەیی*، ڕۆمانێکی تری پاموکە، لە هاوینی ٢٠٠٨دا کەوتە بازاڕەوە و مانگێک دوای بڵاوبوونەوەی بە

زمانی تورکی، وەر گێڕدرایە سەر سی زمانی زیندووی جیهانی. ئەم ڕۆمانە یەکەم کاری نووسەرە لەدوای وەرگرتنی خەڵاتی ئەدەبیاتی نۆبل و سەرانسەریش بۆ ئەڤین و ڕۆمانسیەت تەرخان کراوە. پاموک ساڵی ٢٠١٤، ڕۆمانی *سەمەرەیەک لە سەرمدای* بڵاو کردەوە، کە چیرۆکی بۆزافرۆشێکی ئیستانبول بە ناوی مەولود دەگێڕێتەوە. *ژنە قژسوورەکە*یش نوێترین ڕۆمانی نووسەرە، کە ساڵی 2016 چاپ و بڵاو کرایەوە و تیایدا لەسەر بابەتەکانی وەک ئەڤین و ئیرەیی و ڕەهەندە مێژووییەکانی پەیوەندیی نێوان کوڕ و باوک کار دەکات.

بە زمانی کوردی و بە کوردستانەوە، بەرهەمەکانی پاموک بە زیاتر لە پەنجا زمان لە سەد و هێندە وڵاتی جیهاندا دەخوێنرێنەوە. نووسەر ساڵی ٢٠٠٥، خەڵاتی ئاشتیی کۆبەندی وەشانخانەکانی ئەڵمانیای وەر گرت، کە دیارترین خەڵاتی بواری کولتووریی ئەڵمانیایە و لە ساڵی ١٩٥٠ەوە دابەش دەکرێت. خەڵاتی ساڵانەی Le Prix Médicis étranger بۆ باشترین ڕۆمانی بیانی لە فەرەنسا، ساڵی ٢٠٠٥ بە ڕۆمانی *بەفر* ڕەوا بینرا. نووسەر لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Richarda Huchی وەر گرت، کە هەر سێ ساڵ جارێک لە شاری دارمشتادتی ئەڵمانیا بە «کەسایەتیی خاوەن بیری ئازاد و هەڵوێستی بوێرانە» دەدرێت. گۆڤاری Time، لە ساڵی ٢٠٠٦دا، پاموکی وەک یەکێک لە ١٠٠ کەسایەتیی کاریگەری ساڵ هەڵبژارد. ڕۆمانی *بەفر*، لە هەمان ساڵدا خەڵاتی Le Prix Méditerranée étrangerی پێ درا. پاموک ئەندامی شانازیی American Academy of Arts and Lettersی

ئەمەریکی و ئەندامی شانازیی ئەکادیمیای زانستی مرۆییی چینە. نووسەر ساڵی ٢٠٠٦، خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی وەر گرت و بوو بە دووەم لاوترین کەس لە مێژووی پێدانی خەڵاتی نۆبڵدا.

## بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕ

١. ماڵی بێدەنگ-ئۆرهان پاموک
٢. ژنە قژسوورەکە -ئۆرهان پاموک
٣. ئەزموونەکان-ئەلبێر کامۆ
٤. من درەختێکم -ئۆرهان پاموک
٥. باوڵەکەی باوکم -ئۆرهان پاموک
٦. سەمەرەیەک لە سەرمدا -ئۆرهان پاموک

**لەم کتێبەدا کارم کردووە بۆ هەڵبژاردنی نووسینە هەرە بەهێز و هەرە ئاسانەکان بۆ تێگەیشتن، لەناو ئەو پەڕانەدا کە تاکو ئێستا نووسیومن.**

چەند پەڕەیەک لە مێژوو، سەردەمی منداڵی و چیرۆکی قوتابخانە:
کاتێک ئۆرهان پاموک ئەم پارچانەی لە کتێبەکانیەوە هەڵبژارد و خستنیە ناو ئەم کتێبەوە، دەستکاریی دەقەکانی کرد، نووسینە کۆنەکانی گۆڕی، بڕگە و ڕستەی بۆ زیاد کردن، سەردێڕی بۆ دانان. ئەم هەڵبژاردەیەی کە پێک هاتووە لە جوانترین پەڕەکانی چل ساڵ ژیانی نووسینی پاموک، سەرنجی هەم خوێنەرە نوێ و گەنجەکان، هەم خوێنەرە کۆنەکانی ڕادەکێشێت.
"لەناو دڵی ئەم کتێبەدا دوو بابەت هەیە، کە ئارەزوومە لەبارەیانەوە خەیاڵدانم بخەمە گەڕ و خەیاڵ بئافرێنم، کە ئەوانیش: سیمای نهێنیداری مێژوو، هەروەها یادگارییەکانی ساڵانی منداڵی و خوێندکاری. لە ڕۆمانەکانمدا، لە نووسینە ئاساییەکانمدا، هەموو کات گەڕاومەتەوە بۆ ئەم دوو بابەتەوە. هەموو جارێکیش هەستم کردووە کە هەردوو بابەتەکە لەناو سەرمدا چوونەتەوە ناو یەک. واتە لایەنی منداڵئاسای مێژوو، لەگەڵ لایەنی مێژوویی منداڵی."



٤٠٠٠ دینار